# گەشتی تامەزرۆیان

## کۆمەڵێک چیرۆک و ئامۆژگارییە
## هانی مرۆڤ دەدات بۆ دامەزراوی لە سەر دین


نووسینی

**د. محمد العریفي**





وەرگێرانی
عبدالمجید عبدالحمید
(کفری)

پێداچوونەوەی
د. صلاح الدین عبدالکریم
(چەمچەماڵ)





چاپی دووەم ١٤٣٠ك / ٢٠٠٩ز

# گەشتی ئامەزرۆیان

**کۆمەڵێک چیرۆک و ئامۆژگارییە هانی مرۆڤ دەدات بۆ دامەزراوی لەسەر دین**

نووسینی

د. محمد العريفي

وەرگێرانی

(باوکی یوسف)

م. عبدالمجيد عبدالحميد / كفری

پێداچوونەوەی

م. صلاح الدين عبدالكريم / چەمچەماڵ

چاپی دووەم

١٤٣٠ك /٢٠٠٩ز

٣

# گەشتی تامەزرۆیان

**کۆمەڵێک چیرۆک و ئامۆژگارییە هانی مرۆڤ دەدات بۆ دامەزراوی لەسەر دین**


نووسینی

د. محمد العریفي

وەرگێڕانی

(باوکی یوسف)

م. عبدالمجید عبدالحمید / کفری

پێداچوونەوەی

م. صلاح الدین عبدالکریم / چەمچەماڵ



چاپی دووەم

١٤٣٠ك / ٢٠٠٩ز

# پێناسەی پەرتووک

**ناوی کتێب:** **گەشتی تامەزرۆیان .**
**ناوی نووسەر:** د. محمد العريفي.
**ناوی وەرگێڕ:** (باوکی یوسف) م. عبدالمجيد عبدالحميد (٠٧٧٠١٩٩٢٣٩٢).
**پێداچوونەوەی:** م. صلاح الدين عبد الكريم .
**ژمارەی سپاردن:** ژمـارە (١٦٩٥) پـێ دراوە لـە لایـەن وەزارەتـی رۆشـنبیری حکومـەتی هەرێمی کوردستانەوە .
**نۆرە و ساڵی چاپ:** دووەم ــ (١٤٣٠ ك / ٢٠٠٩ز).
**بنکەی بڵاوکردنەوە :** کتێبخانەی سیما / چەمچەماڵ (٠٧٧٠١٢٣٦٠٨٩).
**کتێبخانەی سوننە / سلێمانی.**
**کتێبخانەی زانست / کەلار**
**چاپخانە :** سیڤا / سلێمانی .

# گەشتی تامەزرۆیان

سوپاس و ستایش بۆ ئەو کەسەی رێگای بۆ بەندەکانی بەرەو رەزامەندی خۆی سووك و ئاسان کردووە ... وە هیدایەتی بۆیان روون کردووەتەوە و پێغەمبەری خوای ﷺ کردووەتە بەڵگە بە سەریانەوەو خۆی رازی بووە ببێتە پەروەردگاری ئەوان و ئیسلام بە دینی ئەوان و محمد ﷺ بە پێغەمبەری ئەوان.. سوپاس و ستایشی ئەو دەکەم .... سوپاس و ستایشی کەسێك کە هیچ پەروەردگارێکی تر جگە لەو نییە .. وە سوپاسی دەکەم بۆ ئەو هەموو چاکەو بەخششە .. وە شایەتی دەدەم حەڵاڵ ئەوەیە ئەو حەڵاڵی کردووەو حەرامیش ئەوەیە ئەو حەرامی کردووەو ئاینیش ئەوەیە ئەو داینا‌وەو دایرێژاوە .. وە شایەتی دەدەم هیچ خودایەك جگە لە (الله) نییە و تەنها و بێ هاوەڵە .. پادشای راستی و ئاشکرایە .. فەرمان دەکات و نەهی دەکات .. وە ئەوەی ویستی لێ بێت ئەنجامی دەدات .. وە شایەتی دەدەم کە (محمد) ﷺ بەندەو هەڵبژێردراوی ئەوەو پێغەمبەری رازیکراوە .. هیچ وتەیەك لە خواستی خۆیەوە ناکات ... خوای گەورە رەوانەی کرد لەسەردەم وماوەیەکدا کە پێغەمبەران نەمابوون بە هۆی ئەوەوە خەڵکی بۆ روناکترین رێگا نیشان دا .. بە پەیامەکەی زەوی رووناك بووەوە لە پاش تاریکی و دڵەکانی پەیوەست کرد بە یەکەوە لە پاش جودا بوون و جیاوازیان ... سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت بە ئەندازەی ئەوەی بەندە لە خواترسەکان یادیان کردووە، وە سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت بە قەد ئەوەی شەوگار و رۆژگار دێن و دەچن.

## لە پاشاندا ....

ئەمە گەشتێکە لەگەڵ تامەزرۆیەکدا .. بەڵێ تامەزرۆ بۆ چوونە ناو بەهەشت.. وە بینینی خوای زەوی و ئاسمانەکان .. ئەمە باسێکە دەربارەی تامەزرۆیان .. ئەوانەی دینەکەی خۆیان بە گەورە دەزانن ... ئەوانەی کە شەهەوات و ئارەزوو رووبەڕوویان دەبێتەوەو تام و چێژەکان دەوریان دەگرێت .. کەچی رووی لێ ناکەن، ئەوان چیا بەرزو بڵندەکانن .. پاڵەوانە دامەزراوەکانن .. پەیمانیان بە خوای خۆیان داوە کە ئارام بگرن، ئەوان وتیان: پەروەردگارمان (اللّه) یە و پاشان دامەزراو بوون و لەسەر ئەو رێگەیە بەردەوام بوون .. دەبینن خەڵکی لەسەر رێگای بەردەوام بوون دەگەڕێنەوە.. کەچی ئەوان لەسەر گوێڕایەڵی دامەزراون... گەورەترین شت لە خوای خۆیان نزیکیان بکاتەوە دامەزراو بوونیانە لەسەر دینەکەیان .. وە پەلە دەکەن لە تەوبە کردن لە پاش تاوانێك ئەگەر ئەنجامی بدەن.. ئەوانە کۆمەڵێکن ئەگەر تاوان بکەن ئەوا داوای لێخۆشبوون دەکەن .. وە ئەگەر ناوی خوا بهێننە یادیان ئەوا یادی خوا دەکەن .. وە ئەگەر بە سزای خوا بیانترسێنن ئەوا دڵیان رادەچەڵەکێ .. وازیان هێناوە لە تام و چێژی لای پادشا و سوڵتانەکان .. وە لە دەسەڵات و پلەو پایە .. تەنها لە پێناوی ئەوەی لە ئاگر رزگاریان بێت و رەزامەندی پەروەردگاریان دەست بکەوێت..

﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٧) أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ (١٨) أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلًا بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ(١٩)﴾
[سورة السجدة].

واتە: جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوە و شاراوەتەوە لە نازو نیعمەتی جۆراو جۆر لای پەروەردگاری، کە چاوان پێی گەش دەبنەوەو بە دیتنی شاد دەبن، لە پاداشتی کار و کردەوەی چاك و پاكیاندا کە ئەنجامیان دەدا * ئایا ئەو کەسەی ئیماندار بوو بێت وەك ئەو کەسەیە کە تاوانبار بوو بێت؟ وەك یەك نین .. * بەڵکو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، شوێنیان باخچەکانی بەهەشتە ( کە بۆ هەمیشە جێگەی حەوانەوە و حەسانەوەیانە) ، هەر لەوێ دادەبەزن، لە پاداشتی کارو کردەوەیەك کە دەیانکرد)[1].

ئەوانەش مرۆڤن وەکو مرۆڤەکانی تر، وازیان لە تام و چێژەکان نەهێناوە لەبەر ئەوەی لێی بێزارن .. یان ناتوانن ئەنجامی بدەن بەڵکو ئەوانیش حەز و ئارەزوویان هەیە .. بەڵام کۆتیان کردووە بە کۆتی بە هێزی شکۆدار لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن، لە سزای رۆژێکی مەزن .. پەیمانیان بە خوای خۆیان داوە کاتێ کە پێی فەرموون:

---

(١) تەفسیر کردنی هەموو ئایەتەکانی ناو ئەم نامێلکەیە لە تەفسیری ئاسان ەوە وەرگیراوە لە نوسینی رێزدار بورهان محمد أمین.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ(١٠٢)﴾ [سورة آل عمران].

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بە شێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیەو هەمیشە پابەندو دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر کاتێك مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن.

بۆیە دامەزراو بوون لەسەر دینەکەیان ... تاکو بە موسڵمانی مردن .. شەیتان سەر نەکەوت لە راپێچکردنیان بەرەو مەی و مەیخانەکان .. یان تێکەڵ بوونی خراپەکاران .. یان کۆچ کردن بۆ وڵاتی بێ باوەڕان .. خەڵکی دەکەونە نێو حەرامەوە کەچی ئەوان دامەزراون لەسەر ئیسلام، سەیرە .. چەندە ئەوان زیرەکن؟؟!! وە سووربوونیان لەسەر دینەکەیان چەندە بە هێزە؟! چەندە دامەزراون؟! هەمووان خۆزگە دەخوازن کە ژیانی ئەوان بەسەر ببەن ئەگەر لە دونیایشدا خۆزگەیان پێ نەبەن ئەوا لە دوا رۆژدا خۆزگەیان پێ دەبەن .. وە هەر کەسێ خۆی بەوان بچوێنێ و داوای هیدایەتێك بکات کە خوای گەورە لێی رازی بێت و خۆشگوزەرانییەکی هەمیشەیی بە دەست بهێنێ .. ئەوا نابێت لەسەر جێگەکەی خۆی دانیشێت.. وە چاوەڕوان بێت لە ئاسمانەوە هیدایەتی بۆ دابەزێ.. یان لەگەڵ ئاودا بیخواتەوە .. نەخێر بەڵکو دەبێت هەوڵ بدات بۆ بە دەست هێنانی .. وە بگەڕێت بۆ رێگاکانی و شوێنکەوتنی .. چونکە ئەگەر یەکێك داوای ئافرەتێکی جوان بکات ئەوا لە مارەیی ناترسێت ..!!

(ئیمامی مسلم) ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی:

(یا عبادي کلکم ضال إلا من هدیته فاستهدوني أهدکم)[٢].

واتە: ئەی بەندەکانم هەمووتان گومڕان تەنها ئەوانە نەبن کە من ڕێنموویم کردوون، کەوابوو داوای ڕێنموویم لێ بکەن تاکو ڕێنموویتان بکەم.

فەرمانی کردووە بە داواکردنی و ڕێگا گرتنی تاکو بە دەستی بهێنێ ...

## پاڵەوان

گەنجێك لە سەرەتای تەمەنیدایە .. لەماڵێکی دەوڵەمەندو پڕ سەروەریدا گەورە بووە .. ژیان و جێگایەکی خۆش .. لەنێو کەس و کاریدا ڕێزدار بوو.. لە وڵاتی خۆیدا شکۆدار بوو .. پێشەنگی هاوەڵانی بوو .. بێ وێنەی سەردەمی خۆی بوو .. تەماشای (سەلمانی فارسی) بکە ﷺ .. ئەو کەسێکی ئاگرپەرست بوو .. ئاگری دەپەرست .. باوکی گەورەی کەس و کارەکەی بوو .. کوڕەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست .. لە تەنیشت ئاگرەکە و لە ماڵی خۆیدا بەندی کردبوو .. هێندە لەگەڵ ئاگردا بوو، بۆیە لە ئاگر پەرستیدا لێهاتوو بوو .. تاکو پلەی گەیشتە ئەوەی کە ئەو ئاگرەکانی دادەگیرساند، باوکی باخچەیەکی گەورەی هەبوو .. هەموو ڕۆژێ سەردانی دەکرد .. ڕۆژێك باوکی لەماڵەوە بەهۆی هەندێ کارەوە خەریك بوو .. بۆیە

(٢) (رواه مسلم، وانظر: صحیح الترغیب والترهیب: ١٦٢٥، وصحیح الجامع الصغیر: ٤٣٤٥).

بە (سەلمان) یﷺ ووت: برۆ بۆ باخچەکەو هەندێ کار هەیە ئەنجامی بدە.. (سەلمان ﷺ خۆشحاڵ بوو، لە بەندییەکەی دەرچوو .. ڕووی کردە باخچەکە، لەڕێگادا چاوی بە (کەنیسە)یەك کەوت .. گوێبیستی نوێژەکەیان بوو .. چووە ژوورەوە تەماشای کرد بۆ ئەوەی بزانێت ئەوان چی دەکەن، سەرسام بوو لە جوانی نوێژەکەیان... نوێژەکەی ئەوانی چووە دڵەوەو حەزی کرد شوێنی ئەوان بکەوێت .. لەدڵی خۆیدا فەرمووی: ئەم دینە لە دینەکەی ئێمە باشترە .. پرسیاری دینەکەی ئەوانی کرد .. وتیان: بنەمای ئەم دینە لە (شام) ە ..وە زاناترین کەس دەربارەی ئەم دینە لەوێیە .. لەوێ مایەوە تاکو ڕۆژئاوا بوو .. کاتێ گەڕایەوە باوکی وتی : کوڕم لەکوێ بوویت؟ فەرمووی: بە تەنیشت کۆمەڵێکدا تێپەڕیم لە (کەنیسە)یەکدا نوێژیان دەکرد.. سەرسامی چۆنێتی نوێژکردنەکەیان بووم و چووە دڵمەوە.. وە بینیم کە دینەکەی ئەوان لەدینەکەی ئێمە باشترە .. باوکی ترسا ..

ووتی: کوڕم دینەکەی تۆو باوك و باپیرت لە دینەکەی ئەوان [illegible]شترە .. فەرمووی: نەخێر .. سوێند بەخوا .. بەڵکو دینەکەی ئەوان لە [illegible]ینەکەی خۆمان باشترە .. باوکی ترسا لەوەی لە دینی (مەجوسی) هەڵگەڕێتەوە .. بۆیە کۆت و زنجیری لە پێ کردو لەماڵەوە بەندی کرد .. کاتێ کە (سەلمان) ﷺ ئەوەی بینی .. کەسێکی نارد بۆلای گەورەکەیان و پێی فەرموو: (من ڕازی بووم بە دینەکەتان و حەز دەکەم بێمە نێو دینەکەتانەوە .. ئەگەر هەرکەسێك لە (شام) ەوە هات لە گاورەکان، ئەوا ئاگادارم بکەنەوە)

ماوەیەکی کەمی بەسەردا چوو .. چەند کەسێك لە (شام) ەوە هاتن .. چەند بازرگانێکی گاور .. ناردیان بە شوێنی (سەلمان) دا ﷺ و ئاگاداریان کردەوە .. بە نێردراوەکەی فەرموو: (ئەگەر بازرگانەکان لە کارەکەی خۆیان بوونەوەو ویستیان بگەڕێنەوە ئەوا ئاگادارم بکەنەوە) کاتێ بازرگانەکان لە کارەکەیان بوونەوە ناردیان بە شوێنیداو جێگایەکیان دەست نیشان کرد بۆ بەیەك گەیشتنیان .. هەوڵیدا تاکو کۆت و زنجیرەکەی لەپێی خۆی کردەوە .. پاشان چوو بۆلایان و پێکەوە دەرچوون بۆ (شام) .. کە گەیشتنە (شام) پرسیاری کرد زاناترین کەس لەم دینەدا کێیە؟ ووتیان: ئەو قەشەیەیە کە لە (کەنیسە)کەدایە .. ڕووی کردە (کەنیسە)کە .. باسەکەی خۆی بۆ قەشەکە کرد .. پاشان فەرمووی: من حەزم لەم دینەیەو پێم خۆشە لەگەڵتدا بم .. خزمەتت بکەم .. نوێژت لەگەڵدا بکەم .. لە تۆوە فێربم .. قەشەکە ووتی: لەگەڵمدابە .. (سەلمان)ﷺ لە (کەنیسە)کە لەگەڵ ئەودا مایەوە، (سەلمان)ﷺ لەو ماوەیەدا سوور بوو لەسەر چاکە کردن .. سوور بوو لەسەر نوێژەکانی و خواپەرستی .. بەڵام قەشەکە کەسێکی خراپ بوو لەسەر دینەکەی .. خەڵکی هان دەدا بۆ ماڵ بەخشین و فەرمانی پێ دەکردن .. کەچی کاتێ پارەیان کۆدەکردەوە .. بۆ خۆی دەیشاردەوە و بە هەژارانی نەدەدا.. بۆیە (سەلمان)ﷺ زۆر ڕقی لێبوو، بەڵام نەیدەتوانی هیچ کەسێك ئاگادار بکاتەوە .. چونکە قەشەکە لەناو خەڵکیدا ڕێزدارەو ئەمیش کەسێکی نامۆیە و تازە چووەتە سەر دینەکەیان .. پاش ماوەیەك قەشەکە مرد .. خەڵکەکە زۆر غەمبار بوون .. کۆبوونەوە بە مەبەستی ئەوەی بینێژن

.. کاتێ (سەلمان)ﷺ غەمباری ئەوانی بینی فەرمووی: ئەم قەشەیە کەسێکی خراپ بوو .. فەرمانی پێ دەکردن بە ماڵ بەخشین و هانی ئێوەی دەدا کەچی کاتێ پارەتان بۆی بهێنایە ئەوا بۆ خۆی کۆی دەکردەوەو هیچی بە هەژاران نەدەدا ..وتیان: بەڵگەت چی‌یە لەسەر ئەو قسانە؟ فەرمووی: من جێگای گەنجینەکەتان پێ دەڵێم .. لەگەڵیاندا ڕۆیشت تاکو جێگای پارەکەی دەست نیشان کرد .. جێگەکەیان هەڵکەندو حەوت کوپەیان دەرهێنا .. کە هەمووی پڕ بوو لە زێڕ و زیو .. ووتیان: سوێند بەخوا دەبێ ئەم کابرایە نەنێژین .. پاشان لەسەر دارێك لە خاچیانداو بەرد بارانیان کرد.. پاشان کابرایەکی تریان هێناو لەجێگای ئەویان دانا لە (کەنیسە)کە... (سەلمان) فەرمووی: هیچ کەسێکم نەبینیوە نوێژەکانی بەو شێوەیە بەجوانی ئەنجام بدات .. لەکابرای پێشوو باشتر بوو.. زۆر تامەزرۆی ڕۆژی دوایی بوو .. هیچ دڵی بە دونیا خۆش نەبوو .. بە ڕۆژو بە شەو هەوڵیدەدا .. بۆیە ئەوم زۆر خۆشدەویست .. خۆشەویستییەك کە نازانم هیچ شتێکم لەپێش ئەو بەو شێوەیە خۆش ویستبێ .. (سەلمان)ﷺ بەردەوام لەخزمەتی ئەودا بوو .. تاکو تەمەنی گەورە بوو، مردنی نزیك بووەوە .. زۆر غەمبار بوو بە جیابوونەوەی لەوە ترسا لەسەر دینەکەی بەردەوام نەبێت .. پێی فەرموو: ئەی فلان .. دەبینی فەرمانی خوا لە تۆ نزیك بووەتەوە بەچی کەسێك ئامۆژگاریم دەکەی؟ فەرمووی: کوڕم سوێند بەخوا هیچ کەسێك نابینم لەسەر ئەم دینە مابێت کە من لەسەری بووم .. خەڵکی بە هیلاکەتدا چوون و دینیان گۆڕاوەو وازیان لە زۆر شت هێناوە..

تەنها کەسێك نەبێت لە شاری (موصلْ) ە، ئەویش ناوی فلأنە تەنها ئەو لەسەر ئەو دینەیە کە من لە سەری بووم بۆیە برۆ بۆ لای ئەو .. کاتێ پیاوە خواناسەکە مرد .. (سەلمان) لە(شام)ەوە دەرچوو و بەرەو (عێراق) کەوتە ڕێ .. گەیشتە لای کابرا لە (موصلْ) لەوێ مایەوە .. تاکو ئەویش مردنی نزیك بووەوە .. ئامۆژگاری کرد بە کەسێکی تر لە (نصیبین)، جارێکی تر خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ (شام) .. تاکو گەیشتە (نصیبین) ماوەیەکی زۆر لای ئەو کابرایە مایەوە تاکو ئەویش لەمردن نزیك بووەوەو ئامۆژگاری کرد بە کەسێکی تر لە (عەمورییە) لە (شام) .. ڕۆیشت بۆ (عەمورییە) لەوێ مایەوە .. وە دەستی کرد بە کارکردن تاکو چەند سەر مانگاو مەڕی پەیدا کرد .. پاشان کابرای خواناس نەخۆش کەوت و لەمردن نزیك بووەوە .. (سەلمان)ﷺ زۆر غەمبار بوو.. بەکابرای فەرموو: ئەی فلأن ئامۆژگاریم دەکەی بە کێ؟ پیاوە خواناسەکە فەرمووی: ئەی (سەلمان)ﷺ .. سوێند بەخوا .. هیچ کەسێك ناناسم لەسەر ئەو دینە بێت کە ئێمە لەسەری بووین، تاکو فەرمانت پێ بکەم بە مەبەستی ئەوەی بڕۆی بۆلای واتە خەڵکی دینی خۆیان گۆڕاوە .. بەڵام دڵنیات دەکەمەوە بە دەرکەوتنی پێغەمبەرێك لەسەر دینەکەی (ئیبراهیم)ە (عليه السلام) .. لە زەوی عەرەبەکانەوە دەردەچێت.. کۆچ دەکات بۆ جێگایەك کە لەنێوان دوو زەویدایە و لە نێوانیاندا دار خورما هەیە .. چەند نیشانەیەکی هەیە و ناشاردرێتەوە ..

- ئەو دیاری وەردەگرێت و ...

- (صدقە) ناخوات و...
- لە نێو شانیدا نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەیە ..

ئەگەر بیبینی دەیناسیتەوە .. ئەگەر دەتوانی بڕۆی بۆ ئەو وڵاتە، ئەوا بڕۆ.. پاشان کابرا مرد و ناشتیان، (سەلمان)ﷺ ماوەیەك لە (عەمورییە) مایەوە .. ئەویش چاوەڕوانی هەلێکە بڕوات بۆ زەوی پێغەمبەرایەتی .. بەو شێوەیە مایەوە .. تاکو کۆمەڵێك (بازرگان) لە هۆزی (کلب) بەلایدا تێپەڕین.. پرسیاری وڵاتی ئەوانی کرد.. لە وەڵامدا وتیان: ئەوان لە وڵاتی عەرەبن.. فەرمووی: لەگەڵ خۆتاندا دەمبەن بۆ وڵاتەکەتان .. وە مانگاو مەڕەکانم دەدەم پێتان؟ وتیان: بەڵێ .. ئەویش هەمووی پێدان .. ئەوانیش لەگەڵ خۆیاندا بردیان .. تاکو گەیشتنە دۆڵی (القری) .. تەماحی سامانەکەیان کرد.. بۆیە ستەمیان لێکردو وتیان: ئەوە بەندەی ئێمەیەو فرۆشتیانە کابرایەکی جولەکە .. (سەلمان) ﷺ نەیتوانی بەرگری لە خۆی بکات.. لای کابرای جولەکە مایەوە خزمەتی ئەوی دەکرد .. تاکو ڕۆژێك ئامۆزایەکی کابرای جولەکەکە لە جولەکەکانی (بني قريظة) بوو لە مەدینە.. هات بۆلای ئامۆزاکەی و (سەلمان)ی ﷺ لەو کڕی .. بەرەو مەدینە بەڕێکەوتن.. کاتێ شارەکەی بینی .. دارخورماکانی بینی .. بەردەکانی بینی زانی ئەو وڵاتە وڵاتی پێغەمبەرایەتییە کە هاوڕێکەی وەسفی بۆ کردووە .. ماوەیەك لەوێ مایەوە .. چاوەڕوانی هاتن و دەرکەوتنی پێغەمبەری دەکرد ﷺ .. چەند ساڵێك تێپەڕی .. خوای گەورە پێغەمبەری خوای ﷺ ڕەوانە کرد .. ماوەیەك لە مەککە مایەوە.. (سەلمان)ﷺ بەهیچ شێوەیەك نازانێت ..

لەبەر ئەوەی زۆر ماندوو دەبوو لەگەڵ کابرای جولەکەداو هەردەم لە خزمەتیدا بوو.. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ مایەوە .. کەچی (سەلمان)ﷺ هیچی دەربارەی نەبیستووە .. ڕۆژێك لەسەر دارخورمایەکی کابرای جولەکە بوو .. کاری دەکردو گەورەکەی لە خوارەوەی دارەکە دانیشتبوو .. ئامۆزایەکی کابرای جولەکە هات بۆلای ئامۆزاکەی و لە تەنیشتی ڕاوەستاو ووتی: ئەی فلان خوا (بەنی قیلە) لەناو بدات (واتە: ئەوس و خەزرەج) ئەوان ئێستا لای کابرایەك کۆبوونەتەوە لە (قباء) لە شاری مەککەوە هاتووەو بە پێغەمبەری دەزانن، کاتێ (سەلمان) ﷺ ئەوەی بیست .. هەموو جەستەی دەستی بە لەرزین کردو دڵی دەستی بە فڕین کرد .. بەشێوەیەك دارەکە دەستی بە لەرزین کرد .. خەریك بوو بکەوێتە خوارەوە .. پاشان بەپەلە دابەزی.. بەشێوەیەك هاواری کرد بەسەر پیاوەکەدا: چی دەڵێی؟ ئەم هەواڵە چییە؟ گەورەکەی پەست بوو، دەستی بەرزکردەوەو بەتوندی زلەیەکی لێداو ووتی: تۆ چیتە بەسەر ئەم قسانەوە؟ بڕۆ بۆ سەر کارەکەت .. (سەلمان) ﷺ بێدەنگ بوو .. چووە سەر دارخورماکە بۆ ئەوەی کارەکەی تەواو بکات .. بەڵام دڵی لای هەواڵی پێغەمبەرایەتییە.. وە دەیەوێ دڵنیا بێت لە سیفاتی ئەم پێغەمبەرەﷺ .. ئەو وەسفانەی کە هاوڕێکەی بۆی باس کردووە ..

- دیاری وەردەگرێت..
- وە (صدقه) ناخوات ..
- وە لەنێوان هەردوو شانیدا نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەیە ..

کە شەو هات بەسەردا .. هەموو ئەو خواردنانەی هەیبوو کۆی کردەوەو لە ماڵ دەرچوو تاکو گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.. کە لە (قبـاء) دانیـشتبوو.. چـووە ژوورەوە .. کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵانی لـە دەوری دانیـشتبوون، سـەلمان ﷺ فـەرمووی: پـێم گەیـشتووە کـە ئێـوە نـامۆن و پێویستیتان بەیارمەتییە .. منیش هەندێ شتم هەبوو بۆ (صدقە) دامنابوو.. بۆیە بۆ ئێوەم هێناوە .. پاشان (سەلمان) ﷺ ئەو خواردنەی کە هێنابووی لـە پـێش پێغەمبـەری دانـا ﷺ.. پاشـان لـە سوچێکەوە دانیـشت تەماشـا دەکـات بزانـێ چـی دەبینـێ؟ .. پێغەمبـەری خـوا ﷺ تەماشـایەکی خواردنەکەی کرد، پاشان ڕووی لە هاوەڵانی کرد و فەرمووی: ئێوە بخۆن .. کەچی خۆی دەستی بۆ هیچ نەبرد و هیچی نەخوارد.. کـاتێ کـە (سـەلمان) ﷺ ئەوەی بینی لە دڵی خۆیدا فەرمووی: ئەمـە یەکێکـە لـە نیـشانەکان .. ئـەویش نـەخواردنی (صـدقە) یـە، ئێـستا دوو نیـشانەی مـاوە .. پاشـان گەڕایەوە بۆلای گەورەکەی .. پاش چەند ڕۆژێك .. کۆمـەڵێ خـواردنی تـری کۆکردەوە .. پاشـان ڕۆیـشت بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـواو ﷺ سـڵاوی لێکردو فەرمووی: من تۆم بینی (صدقە) ت نەخوارد، بەڵام ئەمەی هێناومـە دیارییـەو بـە دیـاری دەیدەم بـە تـۆ، چـونکە تـۆ کەسـێکی ڕێـزداری .. وە (صدقە) نییە، پاشان لەبەر دەسـتی پێغەمبـەری خـوای ﷺ دانـا، ئـەویش دەستی بۆ درێژ کردو دەستی بە خواردنی کردو هاوەڵانیش لەو خواردنەیان خـوارد .. کـاتێ (سـەلمان) ﷺ ئـەوەی بینـی لـە دڵـی خۆیـدا فـەرمووی: ئەمـەیش یـەکێکی تـر .. ئێـستا یـەك نیـشانە مـاوە .. ئـەویش نیـشانەی

پێغەمبەرایەتییە کە لەنێو شانیدایە .. بەڵام چۆن؟ چەند ڕۆژێك مایەوە .. پاشان ڕۆیشت بە شوێنی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەگەڕا .. لە دواییدا پێغەمبەری خوای ﷺ لە (بقيع الغرقد) بینی کە شوێنی تەرمی کابرایەکی (ئەنصار)ی کەوتووە .. هات بۆ لای .. بینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدایە.. دوو کراسی لەبەردایە .. یەك لەسەر یەکن .. وەکو جل وبەرگی ئیحرام .. سڵاوی لێکرد و تەماشای پشتی دەکرد .. بەمەبەستی ئەوە سوڕایەوە ئەو نیشانەیە ببینێ کە هاوڕێکەی بۆی وەسف کردووە .. کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سوڕانەوەکەی (سەلمان) ی ﷺ بینی زانی ئەم کابرایە دەیەوێت لە شتێك دڵنیا بێت بۆی وەسف کراوە .. بۆیە شانەکانی جوڵاندەوە و عاباکەی لەسەر شان لادا .. (سەلمان) ﷺ تەماشایەکی نیشانەکەی کرد .. یەکسەر ناسییەوە .. بۆیە خۆیدا بەسەریدا و ماچی کردوو دەستی بە گریان کرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەرە لەپێشم دانیشە، ئەویش سوڕایەوە تاکو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕوویەڕوو بوونەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری هەواڵی ئەوی کرد .. ئەویش بە جوانی باسی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە .. وە باسی ئەوەی بۆ کرد کە ئەو گەنجێك بووەو لە ژیانێکی خۆشدا دەژیا .. کەچی وازی لەسەروەری هێنا .. بەمەبەستی وەرگرتنی باوەڕو هیدایەت .. تاکو بەنێو قەشەکاندا سوڕایەوە .. خزمەتی ئەوانی دەکردو لەوانەوە فێر دەبوو .. تاکو لە کۆتاییدا لای کابرایەکی جولەکە لە شاری مەدینە جێگربوو .. پاشان (سەلمان) ﷺ تەماشای پێغەمبەری خوای ﷺ دەکردو فرمێسك بەسەر

ڕوومەتیدا دەهاتە خوارەوە.. لە خۆشی و شادیدا .. پاشان بووە موسڵمان .. وە شایەتمانی هێنا.. پاشان ڕۆیشت بۆلای کابرای جولەکە .. بۆیە جولەکەکە کارکردنەکەی لەسەر گران کرد .. هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەردەم لە خزمەتی پێغەمبەردا بوون ﷺ .. بەڵام (سەلمان) ﷺ لەبەر کۆیلایەتی نەیدەتوانی لە خزمەتیدا بێت .. تاکو جەنگی (بەدر) و (ئوحد) ی لەدەست دەرچوو .. کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینی پێی فەرموو: نوسینێك بنووسە ئەی (سەلمان)ﷺ .. واتە خۆت لەگەورەکەت بکڕە بە پارەیەك کە پێی دەدەی .. بۆیە (سەلمان) ﷺ داوای لە کابرای جولەکە کرد نوسینێك لەنێوانیاندا هەبێت.. کابرای جولەکە کێشەکەی لەسەر گران کردو داوای چل ئۆقیە زێڕو سێ سەد دارخورما بە بچووکی بە (فەسیلە) پیێ کۆبکاتەوە، پاشان بینێژێت .. بەمەرجێك هەمووی سەوز بێت .. کاتێ (سەلمان) ﷺ مەرجەکانی کابرای جولەکەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو، خۆشەویستیش ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: یارمەتی براکەتان بدەن بە دارخورما .. موسڵمانان یارمەتییاندا .. هەریەك لە موسڵمانان چوون بۆ باخچەی خۆیان و هەریەکە بە گوێرەی توانای خۆی (فەسیلە) یان هێنا .. کاتێ ئەو (فەسیلە) یانە کۆبووەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی (سەلمان) ﷺ بڕۆ چاڵی بۆ بکە بە مەبەستی ناشتنی، کاتێ ویستت (فەسیلە)ەکان بنێژی، ئەوا مەینێژە تاکو دێیت بۆ لام و پرسم پێدەکەی .. (سەلمان) ﷺ دەستی کرد بەچاڵکردن .. هاوەڵانی هاوکارییان دەکرد .. تاکو سێ سەد چاڵیان بۆ ئامادە کرد .. پاشان هات و پێغەمبەری ﷺ

ئاگادار کردەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیاندا دەرچوو بۆلای چاڵەکان ..وە هاوەڵانی (فەسیلە)کانیان نزیك دەکردەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستەکانی خۆی دەینێژا .. (سەلمان)ﷺ دەڵێت: سوێند بەو کەسەی گیانی (سەلمان) ی ﷺ بەدەستە .. تەنها یەك داری نەمرد .. کاتێ هەموو دارخورماکانی بە کابرادا .. پارەکە مایەوە.. ڕۆژێك هەندێك ئاڵتونیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێك لە غەزاکانەوە .. ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: فارسییەکە کوا، بۆیە بانگیان کرد .. خۆشەویستﷺ فەرمووی: ئەو ئاڵتونانە ببەو ئەوەی لە سەرت ماوە بە کابرای جولەکەی بدە، (سەلمان) یش ﷺ ئاڵتونەکەی برد.. هەموو پارەکەی بە کابرای جولەکە دایەوەو خۆی ئازاد کرد .. پاشان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، تاکو کۆچی دوایی کرد ...

ئەمە هەواڵی (سەلمانی فارسی) یەﷺ .. ژیانی خۆشی بەجێهێشت .. وڵاتێکی بە جێهێشت کە لێی ڕازی بوو .. وەهەموو جۆرەکانی شەهەوتی بە جێهێشت .. وە سەفەری کرد بۆ وڵاتان و لە زەلیلی خزمەتکاریەوە ڕۆیشت بۆ بەندایەتی تەنها لە پێناوی بە دەست هێنانی هیدایەتێکی هەمیشەیی .. خوای خۆی لە ناخی خۆیدا زۆر بە گەورە زانی .. بە یادو نزیکی ئەوەوە سوکنایی دەهات و بە موناجات و خۆشەویستی ئەوەوە ڕایدەبوارد .. بۆیە هەموو شتێك جگە لە خوا لەبەر چاوی زۆر بچووك بوو .. چەند ڕۆژێکی کەم ماندوو بوو بەڵام لە پاش ئەوە پشوویەکی دوورو درێژ بە شوێنیدا هات .. ئەگەر باسی بەهەشتی بۆ بکرایە ئەوا نەفسی بۆی دەفڕی و تامەزرۆی دەبوو

.. ئەی چۆنە ئەگەر لە ناو بەهەشتدا رابوێرێ و لە دار و درەختەکانی بخوات ... وە تەماشای خوای خۆی بکات .. ئەو کاتە توندی سزاکانی لە بیر دەچێتەوە .. وە ئەو هەموو بەڵایەی لە بیر دەچێتەوە...

فللـهِ ما أبْهَـى ثَباتَهُـم لَه وقـدْ ... حَصَلَتْ تِلـكَ الـجَوائِزِ تُقسَمُ
دعاهُـم فلبُّـوه رِضـاً و مَـحبّةً ... فَلمّا دَعَوْه كانَ أقْرَبَ مِنهُـمُ
يُنـادُونَـهُ يا ربّ يا ربّ إنّنَـــا ... عبيدُكَ لا نَبغِي سِوَاكَ وتَعلـمُ
ولوْ كانَ يُرضِي اللهُ نَحْر نُفُوسِهم ... لـدانُوا بهـا طَوعـاً ولله سَلّمُوا
كَمَا بَذَلُوا عِندَ الجِهادِ نحورُهم ... لأعدائه حَتّى جَرىَ مِنهمُ الدّمُ
ولله أكبـادٌ هُنالك أُودِعَ الـــ ... غَـرامُ بهـا فالنّارُ فِيهـا تُـضَرّمُ
وللـه أنفَـاسٌ يكــادُ بحَرّهَـا ... يذُوبُ المُحِبُ المستهام المتيم
وللـهِ أفضـالٌ هنـاكَ ونـعـمـةٌ ... وبرٌ وإحسـانٌ وجودٌ ومـرحـمٌ
وللـهِ كــم مِـن عَبـرةٍ مُهراقةٍ ... وأُخـرى على آثارِهَـا لا تقـدمُ
وقد شرقت عينُ المحبِ بدمعِها ... فينظُر من بينِ الدُّمُوعِ ويسجمُ
فباللـهِ مـا عُـذرُ امْـرِئٍ هُـوَ ... مُؤمنٌ بهذا ولا يسْعَى لهُ ويُقدّمُ
ولـكنّمـا التّوفِيقُ بـالله إنّـهُ ... يخُصُّ به منْ شاءَ ـضلاً ويُنعِمُ

*واتە: چەندە جوامێرانەیە دامەزراوبوونیان*

*لە کاتێکدا ئەو خەڵاتانەیان دەستکەوێ لە پاش دابەش کردن*

خوداوەند بانگیانی کرد ئەوانیش بە رازی بوون و خۆشەویستییەوە وەڵامیان دایەوە

کاتێك ئەوانیش بانگی خودایان کرد ئەویش زۆر لێیانەوە نزیك بوو

بانگی خواکەیان دەکەن ..پەروەردگارا پەروەردگارا ئێمە
بەندەی تۆین و جگە لە تۆ کەس بە خوای خۆمان نازانین و خۆتیش
دەزانیت
ئەگەر بە سەربڕینی خۆیان ڕەزامەندی خوای تیادا بێت
ئەوا لێی نزیك دەبوونەوە بە خواستی خۆیان و ملکەچی خواکەیان دەبوون
هەروەکو چۆن لە کاتی جیهاددا گەردنی خۆیان بەخش کرد
بۆ دوژمنەکانی تاکو خوێنی لێ دەڕۆیشت
وە خەڵکی وا هەن تامەزرۆی هیدایەتدان دەکەن .. بەڵام لەبەر ڕق بوونیان
لە هەندێ پیاو چاکان دەبێتە ڕێگرێك لە نیوانیاندا .. یان چەند هەڵوێستێك
لە نیوانیاندا رووی دابێت .. بۆیە لە ناخیدا شتی هەڵگرتووە بەرامبەر بەوان
یان دەبینی چاکسازی و بەردەوامی خۆی پەیوەست کردووە بە
کەسانێکەوە کە یارمەتی دەدەن لە دیندا .. ئەگەر حاڵی ئەوان خراپ بوو..
یان ڕۆژگار کەوتە نێوانیان ئەوا پشت لە دینەکەی خوا دەکات و سەرپێچی
خوای گەورە دەکات .. وە ئەمەیشە حاڵی ئەو کەسانە بوو کە لە ئایینی
ئیسلام هەڵگەڕانەوە .. ئەوانەی کە ئیسلام بوونی خۆیان پەیوەست کردە
ژیانی پێغەمبەرەوە ﷺ تاوەکو ئەوان تێکەڵی دەبن و قسەی لە گەڵدا
دەکەن و لە ناویاندایە .. ئەوا ئەوان دامەزراون لە سەر ئەم دینە .. بەڵکو
شەوانە هەڵدەستان بۆ شەو نوێژ .. بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بوون .. بەڵام کە لێیان
جودا بوویەوە .. ئەوا ئەوان هەڵگەڕانەوەو گومانیان لە دینی خوا کرد و بە
ئیسلام بێ باوەر بوون، تاکو ابو بکر ﷺ پێیانی فەرموو:

(من كان يعبد الله فإن الله حي لم يمت ومن كان يعبد محمدا فإن محمـدا قـد مات)[٣].

واتە: هەر کەسێ ( محمد) ی دەپەرست ئەوا ( محمد) مرد ، وە هەر کەسێ خودا دەپەرستێت ئەوا خودا زیندووە و نامرێت.

بەڵێ .. خودا زیندووەو نامرێت ... نزای نزاکاران دەبیسێ ... وە تەوبەی تەوبەکاران وەردەگرێت .. هەر کەسێ پەنای پێ ببات ئەوا ئەو بەسیەتی .. وە هەر کەسێ بۆ لای هەڵبێ ئەوا زۆر لە خۆی نزیکی دەکاتەوە .. ئەگەر بەندەیەك لە خودی خۆیدا یادی بکات ئەوا ئەویش لە خودی خۆیدا یادی دەکاتەوە .. وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا یادی بکاتەوە ئەوا ئەو لەناو کۆمەڵێکی باشتردا یادی دەکاتەوە .. وە هەر کەسێ تەنها بستێك لێی نزیك ببێتەوە ئەوا ئەو باڵێك لێی نزیك دەبێتەوە، وە هەر کەسێ باڵێك لێی نزیك ببێتەوە ئەوا ئەو شاباڵێك لێی نزیك دەبێتەوە .. وە هەر کەسێ ئیمان لە دڵیدا جێگر بوو، ئەوا ئەو لە سەربەستی خوادا دامەزراو دەبێت ... هەرچەندە بەڵاکە توندتر بێت .. وە ئەگەر حەز دەکەیت با پێکەوە بۆ ئەوێ بڕۆین ...بڕۆ بۆ شاری مەدینەی پیرۆز .. وە تەماشایەکی پێغەمبەری ئازیز بکەﷺ .. لە گەڵ هاوەڵە بەرێزەکانیدا دانیشتووە .. باسی کەعبەی پیرۆزی بۆ دەکردن .. وە باسی فەزڵ و گەورەیی (عەمرە) و ئیحرامی بۆ دەکردن، بۆیە دڵیان لە خۆشی بینینی ئەو جێگا پیرۆزەوە دەستی بە فڕین کرد .. فەرمانی پێ کردن خۆیان ئامادە بکەن بۆ کۆچکردن بۆ ئەو

---

(٣) (رواه ابن ماجة، وصححه الألباني في: صحيح سنن ابن ماجة: ١٦٢٧).

جێگەیە.. وە هانی دان لەو پێناوەدا پێشبڕکێ بکەن .. هەر کە ئامادە بوون وە چەکیان هەڵگرت .. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەزارو چوار سەد کەس لە هاوەڵانی دەرچوون ... بە وتنی (لا اله الا الله) و (لبيك اللهم لبيك) هوە .. پێشبڕکێ دەکەن بۆ وڵاتی پیرۆز (بلد الأمين) کاتێ لە چیاکانی مەککە نزیك بوونەوە .. وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (کە ناوی القصواء بوو) خۆی دا بە زەویداو چۆکی دادا، بۆیە ئەویش هەوڵی دا بەڕێی بخات کەچی هەڵنەستا .. بۆیە خەڵکی ووتیان: (قصواء) سەرپێچی کرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرگیز (قصواء) سەرپێچی نەکردووەو ئەوەیشە لە ڕەوشتی ئەو نییە .. بەڵام ئەوەی کە ڕێگەی لێ گرتووە هەر ئەو کەسەیە کە ڕێگای لە فیلەکانی ئەبرەهە گرت کاتێ کە لە یەمەنەوە لەگەڵ لەشکرێکدا هاتن بە مەبەستی روخاندنی کەعبە کەچی خوای گەورە ڕێگەی لێ گرتن .. پاشان فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە .. هەر کاتێك داوای پلانێکم لێ بکەن کە قەدەغەکراوەکانی خوای تیادا بە مەزنی رابگیرێت ئیللا من دەیدەم پێیان ..پاشان سەرزەمشتی کرد ئەویش هەڵسا .. پاشان رووی کرد لە مەککە تاکو لە جێگایەك نزیك بوونەوە پێیان دەگوت (حودەیبییە) و نزیکی شاری مەککە بوو .. بێ باوەڕان ئەم هەواڵەیان بیست .. بۆیە گەورەکانیان دەرچوون بۆ ئەوەی ڕێگای مەککەی لێ بگرن .. کەچی ئەو رازی نەبوو وە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ بە مەبەستی (عەمرە) بچێتە ناو شاری مەککەوە .. بەردەوام نوێنەر دەهاتن و دەڕۆیشتن لە نێوان خۆی و قورەیشەکاندا .. تاکو نوێنەرێکی قورەیشییەکان هات بە

ناوی (سوهەیلی کوڕی عەمر) .. لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە .. وە لە ساڵی داهاتوودا (عەمرە) بکەن .. پاشان ڕێککەوتنێکیان لە نێوان خۆیاندا نوسی .. لەو ڕێککەوتنەدا (سوهەیل) چەند مەرجێکی دانا لەوانە: هەر موسڵمانێك لە شاری مەککەوە بیەوێ بڕوات بۆ شاری مەدینە دەبێ بگێڕدرێتەوە .. بەڵام ئەگەر هەر موسڵمانێك لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوەو بیەوێ لە مەدینەوە بچێت بۆ مەککە ئەوا شتێکی ئاساییەو وەردەگیرێت .. موسڵمانان وتیان: (سبحان الله) پاك و بێگەردی بۆ خوا .. هەرکەسێ بێت بۆ لامان و موسڵمان بێت بیگەڕێنینەوە بۆ لای بێ باوەڕان؟؟!! چۆن بیگەڕێنینەوە بۆ لای بێ باوەڕان لە کاتێکدا ئەو بە موسڵمانی هاتووە بۆ لامان .. ئەوان لە کاتێکدا لەو گفتوگۆیەدا بوون.. گەنجێك بەرەو لایان هات و لەسەر ئەو گڵە گەرمە ڕێی دەکرد .. وە کۆت وزنجیرەکانی رادەکێشا .. وە هاواری کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ... کاتێ تەماشایان کرد بینیان (أبو جەندەلە)ﷺ کە کوڕی (سوهەیلی کوڕی عەمرە) لە پێشاندا موسڵمان بوو بوو پاشان باوکی ئازاری دابوو وە بەندی کردبوو .. کاتێ دەنگی موسڵمانانی بیست .. خۆی لە بەندەکەی دەرباز کرد و بە کۆت و زنجیرەکەیەوە بەرەو لای موسڵمانان هات .. برینەکانی خوێنیان لێ دەتکا .. چاوەکانی بە خوڕ فرمێسکیان لێ دەهاتە خوارەوە .. پاشان بە جەستە ماندووەکەیەوە خۆی فڕێ دایە بەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ .. وە موسڵمانان تەماشا دەکەن .. کاتێ کە (سوهەیل) ئەمەی بینی .. پەست بوو ..!! چۆن ئەم گەنجە لە بەندەکەی

دەرباز بووە .. پاشان پڕ بە دەنگ هاواری کردو وتی: ئەی (محمد) ئەمە یەکەم شتە من و تۆ لە سەری ڕێك دەکەوین و دەبێ بیگەڕێنیتەوە..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێمە جارێ نوسراوەکەمان مۆر نەکردووە ..

وتی: سوێند بە خوا کەواتە لەسەر هیچ شتێك لەگەڵ تۆدا ڕێك ناکەوم ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەبەر من ڕێگەی پێبدە ..

ئەویش وتی: ڕێگەی پێنادەم ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ بیکە ..

وتی: نەخێر نایکەم ..

پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو ..پاشان (سوهەیل) بە پەلە بەرەو لای کوڕەکەی هەستاو بە کۆت و زنجیرەکەیەوە رایدەکێشا .. وە (أبوجەندەلیش) ﷺ بانگی موسڵمانان دەکات و هاواریان پێ دەکات .. و دەڵێت: ئەی گرۆی موسڵمانان ئایە من دەگەڕێننەوە دەستی بێ باوەڕان لە کاتێکدا من بە موسڵمانی هاتووم بۆ لاتان..؟! ئایە نابینن من لە چی ئازار و ئەشکەنجەیەکدام ..؟ بەردەوام هاواری پێیان دەکرد تاکو لە چاو بزر بوو.. وە موسڵمانان لە خەم و پەژارەدا دڵیان دەتوایەوە .. گەنجێکە لە سەرەتای تەمەنیدایە .. ئەشکەنجەکەی لەسەر زیاد دەکەن .. وە لە ژیانێکی خۆشەوە دەیگوێزنەوە بۆ بەڵایەکی سەخت و دژوار ..لە کاتێکدا ئەو کوڕی یەکێکە لە گەورە ناودارەکان .. چەندەها ساڵ بوو لە خۆشیدا دەژیا ... وە لە نێو شەهەواتدا بوو .. پاشان لە پێش چاوی موسڵمانان بە کۆت و زنجیرەکەی رایدەکێشن .. بۆ ئەوەی بیگەڕێننەوە بەندینخانە و ئاسنەکەی

.. ئەوانیش هیچ دەسەڵات و توانایەکیان نییە .. پاشان (أبو جەندەل) ﷺ بە تەنها گەڕایەوە بۆ مەککە .. داوای دڵنیایی و خۆپاراستن و دامەزراوی لەسەر ئەم دینە لە پەروەردگارەکەی دەکات ..

بەڵام موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە.. لە کاتێکدا زۆر دڵیان پڕ لە قینە بەرامبەر بە بێ باوەڕان .. وە خەم و پەژارە هەموویانی داگرتووە بە هۆی ئەو موسڵمانە بێ دەسەڵاتانەوە کە لە مەککە ماونەتەوە .. پاشان ئازار و ئەشکەنجەی موسڵمانان لە مەککە زیادی کرد .. تاکو چیتر ئامادە نەبوون بەرگەی ئەو ستەمە بگرن .. لە سەرەتادا ( أبو جندل) ﷺ و یەکێ لە هاوەڵانی بە ناوی ( أبو بصیر) ﷺ و موسڵمانە لاوازەکانی مەککە هەوڵیان دەدا لە کۆت و زنجیرەکەیان خۆیان دەرباز بکەن .. تاکو ( أبو بصیر) ﷺ توانی خۆی رزگار بکات و لە بەندینخانە هەڵبێ .. هەر ئەو کاتە رۆیشت بۆ شاری مەدینە.. لەگەڵ خۆیدا تامەزرۆیەکی زۆری هەڵگرتووە .. وە بۆ هیوایەکی پرشنگدار دەڕوانێ .. بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ..

دەشت و چیاو بیابانەکانی دەبڕی.. لەبەر گەرمی ئەو دە‌ ‌ت و دەرە هەردوو پێیەکانی دەسووتا .. تاکو گەیشتە شاری مەدینە .. بەرەو مزگەوتەکە رۆیشت .. لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا لە مزگەوت بوو .. لە پاش ماندوو بوونێکی زۆر (أبو بصیر) ﷺ چووە ژوورەوە بۆ لایان .. کە هێشتا شوێنەواری ماندوو بوون بە روویەوە دیارە.. هەموو پرچی تێك چووە و تۆزاوی بووە .. هێشتا پشووی نەدابوو بینی دوو

کەس لە بێ باوەڕانی قورەیش هاتنە ژوورەوە بۆ مزگەوت .. کاتێ (ابو بصیر) ﷜ ئەوانی بینی .. ترساو شڵەژا .. وە وێنەی کاتی ئازاردانی کەوتەوە یاد .. ئەو دوو کابرایە هاواریان کرد: ئەی محمد .. بیگەڕێنەوە بۆمان .. چونکە ئەوە پەیمانێکە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا .. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پەیمانەی نێوانیانی کەوتە یاد کە هەر کەسێ لە مەککەوە بێت بۆ مەدینە دەبێ بگێڕدرێتەوە .. پاشان داوای لە (ابو بصیر) کرد کە شاری مەدینە بەجێ بهێڵێ .. بۆیە ئەوانیش دەرچوون و (ابو بصیر) یان لەگەڵدایە .. کاتێ لە مەدینە دەرچوون .. دابەزین بە مەبەستی ئەوەی هەندێ خواردن بخۆن .. یەکێکیان لە نزیك (أبو بصیر) ﷜ دانیشت .. وە ئەوی تر لە چاو بزر بوو بە مەبەستی سەرئاو کردن .. ئەوەی کە لە تەنیشت (أبو بصیر) ﷜ دانیشتبوو شمشێرەکەی دەرهێنا .. بە گاڵتەیەکەوە دەیلەراندەوە .. بە گاڵتەیەکەوە بە (أبو بصیر)ی ﷜ ووت: دەبێ بە ئەم شمشێرە بە شەو و بەرۆژ لە (ئەوس و خەزرەج) بدەم .. (أبو بصیر) ﷜ ووتی: بەڵێ سوێند بە خوا من ئەو شمشێرەی تۆ دەبینم زۆر باشە ئەی فلان، وتی: بەڵێ .. سوێند بە خوا ئەوە شمشێرێکی زۆر باشە .. من چەند جارێك تاقیم کردووەتەوە ..

(ابو بصیر) ﷜ ووتی: کوا بیدە پێم با تەماشایەکی بکەم .. ئەویش شمشێرەکەی پێدا .. هەرکە شمشێرەکە لە دەستی جێگر بوو .. بە بێ دواکەوتن بەرزی کردەوەو بە توندی لەسەری داو سەری بڕی .. کاتێك کابرای تر گەڕایەوە لەسەر ئاوەکەی .. بینی کە جەستەی هاوڕێکەی پارچە

پارچە کراوە .... زۆر ترسا .. یەکسەر هەڵات و تاکو گەیشتە مەدینە .. بە پەلە خۆی گەیاندە مزگەوت .. کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بەو ترسەوە بینی .. ووتی: ئەم کابرایە شتێکی ترسناکی بینیوە .. کاتێ لەبەر دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ راوەستا .. لە ترساندا پڕ بە دەم هاواری کردو ووتی: هاورێکەم کوژرا سوێند بە خوا منیش دەکوژرێم .. پاش کەمێك (أبو بصير) ﷺ هاتە ژوورەوە .. هەردوو چاوی تیشك دەداتەوە .. وە شمشێرەکە بە دەستییەوەیەو خوێنی لێ دەتکێ .. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە پەیمانەکەی پاراستیت تۆ منت گێڕانەوە بۆ ئەوان و پاشان خوای گەورە منی رزگار کرد ... بۆیە لای خۆتان وەرم بگرن ..

ووتی: نەخێر ...

(أبو بصير) ﷺ هاواری کردو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند پیاوێکم بدەرێ شاری (مەککە)ت بۆ رزگار دەکەم .. پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لە هاوەڵانی کرد وفەرمووی: هاوار بۆ دایکی جەنگی هەڵگیرساند، ئەگەر چەند پیاوێکی لەگەڵدا بوایە[٤] ..

پاشان پەیمانەکەی نێوان خۆی و قورەیشی کەوتە یاد بۆیە فەرمانی کردە (أبو بصير) ﷺ کە لە شاری مەدینە برۆ دەرەوە.. (أبو بصير) ﷺ ئەو فەرمانەی بیست بە بێ دواکەتن جێبەجێی کرد .. بەڵێ .. لە ناخی خۆیدا هیچ رقێکی بەرامبەر ئەم دینە هەڵنەگرت .. وە موسڵمانانی نەکردە دوژمنی خۆی .. چونکە ئەو تکای هەیە کە خوای گەورە لێی خۆش بێت .. و

(٤) (رواه أبو داود، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح سنن أبي داود: ٢٧٦٥).

پاداشتی بداتەوە .. ئەو پەروەردگارەی کە ئەم لەپێناویدا کەس و کاری خۆی جێ هێشتووەو وازی لە منداڵەکانی هێناوەو خۆی ماندوو کردووەو ئازاری جەستەی خۆی داوە ..(أبو بصير) ﷺ لە شاری مەدینە دەرچوو... سەرسام بوو نەیدەزانی بۆ کوێ بڕوات ..؟؟!! لە مەککە سزاو کۆت و زنجیر هەیە .. وە لە مەدینە پەیمان و بەڵێننامە .. پاشان رۆیشت بۆ (سيف البحر) کە دەکەوێتە باکوری (جدە) لەوێ دابەزی، لە بیابانێکی وشکدا .. هیچ کەسێك هاوەڵ و هاودەمی نییە ... موسڵمانانی مەککە ئەم هەواڵەیان بیست .. زانیان دەرگایەکەو لەوان کراوەتەوە .. چونکە موسڵمانان لە مەدینە ئەوان وەرناگرن ... وە بێباوەڕانیش لە مەککە ئازاریان دەدەن .. بۆیە (ابو جندل) ﷺ خۆی لە کۆتەکەی دەرباز کردو خۆی گەیاندە لای (ابو بصير) ﷺ.. پاشان موسڵمانان پۆل پۆل بەرەو لای ئەوان دەڕۆیشتن.. تاکو ژمارەیان زۆر بوو .. وە بەهێز بوون .. هەرکە کاروانی بازرگانی قورەیشییەکان بە لایاندا تێدەپەڕی .. ئەوا رێیان لێی دەگرت .. کاتێ ئەو رووداوانە زۆر بوون لەسەر قورەیش ... نامەیەکیان نوسی بۆ پێغەمبەری خواو ﷺ داوای لێ دەکەن کە ئەو کۆمەڵە موسڵمانە ببات بۆ لای خۆی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆیان نارد کە بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە ... کاتێ نوسراوەکەی پێغەمبەریان پێ گەیشت ﷺ.. خۆشحاڵ بوون و دڵخۆش بوون .. بەڵام ( أبو بصير) ﷺ زۆر ئازاری دەچەشت و لەسەر جێگای مردن بوو هەردەم ویردێکی دووبارە دەکردەوەو دەیوت:

(ربي العلي الأكبر من ينصر الله فسوف يُنصر) .

واتە: پەروەردگاری من بەرزو بەڕێزە .. هەرکەسێ سەری بخات ئەوا خوای گەورە سەری دەخات ..
کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ لای و هەواڵیان پێدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیزنی داون لە مەدینەدا نیشتەجێ بن وە چیتر لە نامۆییدا نەژێن .. وە کێشەکەیان چارەسەر بوو .. وە چیتر ناخیان دڵنیا بوو ..بۆیە (ابو بصیر) ﷺ خۆشحاڵ بوو .. پاشان ووتی (لە کاتێکدا کە ململانێی لەگەڵ مردندا دەکرد): نوسراوەکەی پێغەمبەرم نیشان بدەن ﷺ.. ئەوانیش پێیان دا .. ئەویش وەری گرت و ماچی کرد .. نوسراوەکەی لەسەر سینگی دانا و ووتی: أشهد أن لا إله إلا الله ....وأشهد أن محمدا رسول الله ... أشهد أن لا إله إلا الله ....وأشهد أن محمدا رسول الله ... پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشاو کۆچی دوایی کرد ...بەڵێ (أبو بصیر) ﷺ کۆچی دوایی کرد .. لە کاتێکدا کە تام و چێژی دونیای نەچەشت ..مرد لە کاتێکدا خزمەتی دینەکەی دەکرد .. وە تێدەکۆشا لە پێناوی خوادا .. مرد .. لە ناخۆشییەکانی ئەم دونیایە رزگاری بوو وە تکای وایە کە خۆشگوزەران بێت لە قیامەتدا .. لە رۆژێکدا تەماشای رووی خوای زەوی و ئاسمانەکان دەکات .. ئەو خودایەی کە لە پێناویدا خوێنی رژاندو لە بیابانەکاندا بە داماوی مرد، وە لە پێناوی ئەودا دەرگای زەوی لێ داخرا .. وە رەنگە دەرگای ئاسمانەکانی بۆ کرابێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هَذَا ذِكْرٌ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ (٤٩) جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ (٥٠) مُتَّكِئِينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ

وَشَرَابٍ (٥١) وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ أَتْرَابٌ (٥٢) هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ (٥٣) إِنَّ هَذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ (٥٤)﴾ [سورة ص].

واتە: ئەمانە هەمووی ناوبانگی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانەیەو بێگومان بۆ پارێزکارو خواناسانیش چاکترین جێگەو رێگەو شوێنمان ئامادەکردووە * باخەکانی بەهەشتی عەدنە، کە هەر هەموو دەروازەکانی لەسەر پشتە بۆیان * تیایدا بە ئاسوودەیی شانیان داداوە، بەردەوام داوای میوەی زۆرو خواردنەوەی هەمەجۆر دەکەن * هەروەها حۆری هاوتەمەنی بە حەیاو شەرم لایانە، کە تەنها عاشقی هاوسەرەکانیانن و چاو بۆ کەسی تر هەڵنابڕن * جا ئا ئەم بەڵێنی ناز و نیعمەتەی پێتان دراوە لە رۆژی پاداشتدا بۆتانت ئامادەیە* بە راستی ئەمە رزق و رۆزیمانە بۆ بەختەوەران، هەرگیز تەواو نابێت و کۆتایی نایەت.

موژدە بۆ (أبو بصیر) ﷺ.. کێ ئەمڕۆ دەتوانێ وەکو ئارام گرتنەکەی ئەو ئارام بگرێ؟؟! گەنجێك خوای گەورە دڵخۆشی کردبوو بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی.. وە بە چاودێری خۆی پاراستی .. وە بە عینایەتی خۆی پارێزگاری دەکرد .. هەموو کێشەی ئەو هەوڵ و تێکۆشان و داواکارییە .. وە جەستەی هەردەم لە خزمەتی نوێژو ئەو کارانەدا بوو کە لە خوای نزیك دەکردەوە .. ئەگەر گریانی ئەوت لە تەنهاییدا ببینیایە .. یان لە خوێندنی قورئان و ئایەتە پیرۆزەکاندا .. ئەوا سینگی وەکو مەنجەڵ دەکوڵا .. وە لە روویدا شوێنەواری ئەو گریانەت دەبینی .. خوای گەورە تام و چێژی خۆشەویستی خۆی پێ دابوو .. خۆشی موناجاتی .. بۆیە ئەوانە لە

شەهەواتی کردبوو .. وە لە تام و چێژەکان خۆی دوور خستبووەوە .. ئەو بە تەواوی رازییە .. هەرچەندە بەڵا لە سەری زۆر بوایە ..

تۆ .. ئەی ئەو کەسەی توشی بەڵا نەهاتووی وە توشی ئازار نەهاتووی .. ئەی ئەو کەسەی لە نێو خۆشگوزەرانیدا دەتلێیتەوە .. وە لە تورەبوونی خوا ناترسی ..؟ ئەی ئەو کەسەی شەو و رۆژ بۆ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای بە عیززەت و لێبوردە بانگ دەکرێیت .. تۆ .. ئەی ئەو کەسەی شەهەوات لێت بێزار بووە .. وە هەڵەکانت یەك لە دوای یەك بوون .. وە تاوانەکانت گەورە بوونە .. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە تەوبە بکەیت ...؟؟ وە واز لە تاوان و گوناهەکان بهێنی و تەوبە بکەی ..؟ وە خواکەت بەردەوام تەماشات دەکات و چاودێریت دەکات ... وە توورە دەبێت و پەست دەبێت .. وە فریشتەکانی خوا دەنووسن و تۆمار دەکەن ... وە دەژمێرن و لە یەکی دەدەنەوە .. کەچی تۆیش نوقمی بێ ئاگابوون بویت.. ئایا ئارام ناگری لە جیابوونەوەی کەمێك تام و چێژ بۆ پشوویەکی گەورە و مەزن .. وە بەهەشتێکی رێزدار؟ ..

| | |
|---|---|
| فاصبر قليلاً إنما هـيَ ساعـةٌ | فإذاً أُصِبتَ فَفي رِضا الرّحمنِ |
| فالقومَ كانوا يألمونَ و يصبرو | ن و صبرُهم في طاعةِ الرحـمنِ |
| فأتعب قليلَ حياتِك الدُّنيا تجدِ | راحَـاتِها و سـرورِهـا بجنـانِ |
| باللهِ ما عُـذرُ امـرئٍ هوَ مؤمـنٌ | حقـاً بهـذا لـيـسَ بالـيقـظـانِ |
| بـل قلبُه في رَقـدةٍ فإذا استفـا | قَ فلبسهُ هوَ حـلّةُ الكسلـانِ |

واتە: کەمێك ئارام بگرە چونکە ئەوە تەنها یەك کاتژمێرە

ئەگەر هاتوو پێکرای ئەوا لە ڕەزامەندی پەروەردگارایت
کۆمەڵێك هەبوون ئازار دەدران و ئارامیان دەگرت
وە ئارامگرتنەکەیان لە گوێڕایەڵی پەروەردگارا بوو
کەمێك خۆماندوو بکە لە ژیانی دونیادا
حەوانەوە و شادی لە بەهەشتدا دەبینیتەوە
سوێند بە خوا هیچ کەسێکی ئیماندار بیانووی نییە
بە ڕاست زانینی ئەم پەیامە ئەوا بە ئاگا نییە
بەڵکو ئەوە دڵی لە خەوێکی قوڵدایە ئەگەر هەستا
ئەوا پۆشاکەکەی پۆشاکێکی تەمەڵییە

ئەوان گوێڕایەڵی خواکەی خۆیانیان دەکرد .. وە لە پێناوی ئەودا گیانی خۆیانیان دەبەخشی .. وە سەروەت و سامان و جەستەی خۆیانیان دەبەخشی .. وە هەرگیز منەتیان نەدەکرد، بە ڕاستی ئەوانە ئیمانداری ڕاستەقینەن ...

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (١٥) قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (١٦)يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (١٧) إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (١٨)﴾ [سورة الحجرات] .

واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بە خـواو پێغەمبـەری خوا هێناوەو پاشان نەکەوتوونەتە هیچ گومان و دوو دڵییەکەوە، بە خۆیـان و سەر و ماڵیشیانەوە تێکۆشاون لە پێناوی ئایینی خـوادا، تـەنها ئـا ئەوانـە ڕاستن * ئەی محمد ﷺ بڵـێ: ئایا ئێـوە خـوای گـەورە لـە ئـایینی خۆتـان ئاگادار دەکەن و پێی ڕادەگەیەنن، لـە حاڵێکدا خـوا زانایـە بـە هەرچـی لـە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا بە هەموو شتێك زانـا و ئاگـادارە * ئەوانـە منەت دەکەن بەسـەر تـۆدا کە گوایـە موسـڵمان بـوون، پێیـان بڵـێ: منـەت مەکەن بە سەرمدا لەسەر موسڵمان بوونەکەتان، بـەڵکو خـوا منـەت دەکـات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتیداون بۆ ئیمان و باوەڕ ئەگـەر ئێـوە ڕاسـتگۆن * بێگومان خوا نهێنی و شاراوەکانی ئاسمان و زەوی دەزانێت، هەروەها خوای گەورە بینایە بە هەموو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

هەرچەندە بەڵاکە سەختتر بێت ....هێشتا ئەوە کەمە چونکە پاداشـتەکەی بەهەشتە ... لە کـاتی بـەڵادا بەنـدە ڕاسـتەقینەکان هەسـت دەکـەن خـوای گەورە لێیانەوە نزیکە ونزاکانی ئەوان دەبیسێ ..هـاوار و موناجـاتی ئـەوان دەبیسێ .. وە پاڕانـەوەکانیان وەڵام دەداتـەوە .. وە پاداشـتیان گـەورەو مەزن دەبێتەوە .. وە تاوان و گوناهەکانیان دەوەرێنێ.. وە خـوای گـەورە پاداشـتی چـاکەکاران بـزر ناکـات .. هەرکەسـێ ئـارام بگـرێ لەسـەر دوور کەوتنەوە لە شەهەوات .. وە چاوی خۆی لـە قەدەغـەکراوەکان پاراست .. وە گـوێی خـۆی لـە گـۆرانی بپـارێزێ .. وە داوێـنی خـۆی بەرامبـەر بـە خراپەکاری و تـاوان بـە پـاکی ڕابگرێـت .. وە دەسـتەکانی و پێیـەکانی لـە

جێگای خراپ دوور بکاتەوە .. بەڵکو هەرکەسێ سەرزەنشتی خۆی کرد بۆ ئەو شتەی کە چاوەکانی دەیبینێ .. یان گوێیەکانی بەوەی کە دەیبیسێ .. یان پێیەکانی بۆ ئەو جێگایانە رۆیشتووە ..یان دەستەکانی بۆ ئەو شتەی کە دەستی لێداوە .. هەرکەسێ زانی خوای گەورە چاودێری بەندەکانی دەکات و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکات ... وە بچوکترین تەماشا کردن و ساتەکانی چاودێری دەکات .. وە هەموو وشەکان و چرپەکانی.. لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکات لەسەر تەنها یەك مسقاڵە زەرِرە .. وە لە ناو وشکانی و ئاودا دەیانبینێ .. هەرکەسێ ئەمە حاڵی بێت ئەوا لە رۆژی قیامەتدا لێپێچینەوەکەی سووك و ئاسان دەبێت .. وە لە کاتی پرسیاردا بە ئاسانی وەڵام دەداتەوە .. وە جێگای خۆش و بەختەوەر دەبێت .. وە موژدەی لێ بێ کە مەنزڵگایەکی زۆر خۆش چاوەڕوانی ئەوە .. لە نزیك خوای گەورە و میهرەبان .. کە هەموو ئازار و بەڵایەك لەگەڵ ئەودا سووك و ئاسانە ..

لەساڵی دەیەمی کۆچی .. لە یەمامە وە (مسیلمة الكذاب) سەری هەڵدا .. لە ناوچەی (نەجد) لە نیمچە دورگەی عەرەب.. وە دەیووت من پێغەمبەرم.. وە قورئانم بۆ دابەزیوە .. وە لە نمونەی قورئانەکەی دەیووت: (والطاحنات طحنا ..والعاجنات عجنا.. والخابزات خبزا.. والثاردات ثردا.. واللاقمات لقما) بەم شێوەیە لەبەر خۆیەوە ورێنەی دەکرد.. وە ناوی لێ دەنا قورئان ..بۆیە قەومەکەی خۆی هەڵخەڵەتاندو ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون.. خەڵکی گێل و بێ ئاگا شوێنی کەوتن .. تاکو وای لێ هات سەرباز و شوێنکەوتەی

هـەبوو .. بۆیـە بـە هـۆی هێزەکەیـەوە لـە خـۆی دەرچـوو .. وە بـە دەسەڵاتەکەی بوغرا بوو .. نوسراوێکی نارد بۆ پێغەمبەری ئـەکرەم ﷺ .. تیایدا هاتبوو ..

لە (موسەیلەمەی) پێغەمبەری خودا بۆ (محمد) پێغەمبەری خودا ..

سلام علیك ..أما بعد ..

وا منیش لەو کارەی تـۆدا شـەریك بوومەتـەوە وە نیـوەی زەوی بـۆ مـن و نیوەکەی تر بۆ قورەیش .. بەڵام قورەیش میللەتێکن تەعەدا دەکەن).

کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نامەکەی خوێندەوە سەرسام بـوو بـە جورئـەتی ئەم کابرایە، چەندە بە زاتە و درۆ دەکات بـە نـاوی خـوای گـەورەوە ..؟!

ئەویش بۆی نوسی ...

بسم الله الرحمن الرحیم

لە (محمد) پێغەمبەری خوداوە .. بۆ (موسەیلەمە) ی درۆزن ..

سڵاو بۆ ئەو کەسەی کە شوێنی هیدایەت کەوتووە .. أما بعد ..

بزانە کە زەوی هی خودایەو دەیداتە هەرکەسێ خۆی بیەوێ و دواڕۆژیش بۆ ئەو کەسانەیە کە تەقوای خوا دەکەن).

پاشان پێغەمبـەری خـوا ﷺ رووی لـە دەوروبـەری خـۆی کـرد، تەماشـای رووی هـاوەڵانی کـرد .. بـە شـوێن کەسـێکی ژیـرو بـە جورئەتـدا دەگـەڕا نامەکەی پێ بسپێرێ و بیبا بۆ (موسەیلەمە) بۆیە (حەبیبی کوڕی زەیـد) ی ﷺ هەڵبـژارد .. ئـەویش بەنـدەی شـەهوەتەکەی نـەبوو کـاتێ خزمـەتی دینەکەی بیتە پێشەوە .. وە لە پێناوی خواکەیدا هیچ تام و چێژێك رێگـەی

لێ نەگرت.. چونکە دڵی پڕ بوو لە ئیمان و دڵنیایی و شەوگاری خۆی بە تەسبیحات و قورئانەوە بەسەر دەبرد .. نوسراوەکەی لە دەستی پێغەمبەرﷺ وەرگرت .. پاشان کەوتە ڕێ .. لە شاری مەدینەوە بەرەو یەمامە .. ئەو ڕێگایەی بڕی کە زیاتر لە هەزار کیلۆمەترە .. تاکو گەیشتە لای (موسەیلەمە)، کاتێ چووە ژوورەوە بۆ لای موسەیلەمەی درۆزن .. نوسراوەکەی پێدا .. موسەیلەمە تەماشای نوسراوەکەی کرد .. بۆیە یەکسەر پێی تێك چوو و پەست بوو .. پاشان کەس و کارەکەی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە .. وە (حەبیبی کوڕی زەید) ی ﷺ لەبەر دەستی خۆیدا وەستاند .. وە پرسیاری لێ کرد دەربارەی نوسراوەکە ..

حەبیب ﷺ ووتی: ئەوە لە پێغەمبەری خوداوەیە ...

موسەیلەمە ووتی: شایەتی دەدەی کە محمد پێغەمبەری خودایە؟؟

حەبیب ﷺ ووتی: بەڵێ شایەتی دەدەم کە محمد پێغەمبەری خودایە ﷺ..

موسەیلەمە ووتی: وە شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟؟

حەبیب ﷺبە گاڵتەیەکەوە ووتی: من گوێم کەڕە بەرامبەر ئەوەی کە تۆ دەیڵێی (مەبەستی ئەوەیە تۆ زۆر لەوە کەمتری کە گوێ لە قسەکانت بگیردرێ).

موسەیلەمە دووبارەی کردەوەو ووتی: شایەتی دەدەی کە محمد پێغەمبەری خودایە؟؟

حەبیب ﷺ ووتی: بەڵێ شایەتی دەدەم کە محمد پێغەمبەری خودایەﷺ..

وتی: وە شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟؟
حەبیب ﷺ وتی: من هیچ نابیستم .. !
پرسیارەکەی دووبارە کردەوە .. حەبیبیش ﷺ هەمان وەڵامی دایەوە .. بۆیە موسەیلەمە پەست بوو .. پاشان جەلادەکەی بانگ کرد .. فەرمانی کرد کە شمشێرێك بدا لە جەستەی ئەم گەنجە .. لە کاتێکدا پرسیارەکەی لێ دووبارە دەکردەوە .. کەچی هەمان وەڵام دەبیستێ .. تەنها پەستی و تورەیی موسەیلەمە زیادی دەکرد.. موسەیلەمە فەرمانی کردە جەلادەکە کە دەمی حەبیب ﷺ بکاتەوەو زمانی ببڕێ .. سەربازەکان گرتیان و دەمیان کردەوە .. تاکو جەلادەکە ئەو زمانەی بڕی کە هەردەم یادی خودای دەکرد.. پاشان لەبەر دەستی موسەیلەمەی تاوانباردا وەستاندیان.. لە کاتێکدا کە لە دەمە پاکەکەیەوە خوێن دەهات .. موسەیلەمە هاواری کرد و وتی: شایەتی دەدەی کە محمد پێغەمبەری خودایە؟؟
حەبیب ﷺ بە سەری ئیشارەتی کرد: بەڵێ ...
وتی: وە شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟؟
دیسان بە سەری ئیشارتی بۆ کرد: نەخێر .. جارێکی تر موسەیلەمە فەرمانی کردە جەلادەکەی .. دەستی بڕی .. پاشان پێی بڕی .. پاشان لوتی بڕی .. پاشان گوێی بڕی .. پاشان جەستەی پارچە پارچە کرد .. وە گۆشتەکەی دەکەوتە خوارەوەو خوێنەکەی دەڕۆیشت .. لە کاتێکدا بەسەر زەوییەکەدا دەتلایەوەو هاواری دەکرد بە هۆی ئازار و ئەشکەنجەوە تاکو مرد ..خوای لێ رازی بێت ..

بەڵێ .. زمانی بڕی .. جەستەکەی پارچە پارچە کرد .. ئێسکەکانی شکاند.. لە پێناوی ڕەزامەندی خوای بەرزو بێ هاوتادا .. تاکو ڕۆژی دوایی ئەگەر لەبەر دەستی خوادا ڕابوەستێ ..خوای گەورە پرسیاری لێ بکات: ئەی بەندەکەم لەبەر چی زمانت بڕا ..؟ لەبەر چی لوتت بڕا ..؟ لەبەر چی دەستت بڕا ..؟ لەبەر چی خوێنت ڕژا ..؟ دەڵێت: لە پێناوی ڕازی بوونی تۆدا ئەی خودایە ..

وما لِجُرحٍ إذا أرْضَاكُمُ ألَمُ

واتە: هەر برینێك ئەگەر ڕەزامەندی تۆی تیادا بێت ئەوا ئازاری نییە .

بەڵێ .. لە پێناوی ئێوەدا ئەی خودایە .. ئەی سەروەرم ... ئەی پەروەردگارم.. ئەی خۆشەویستم .. ئازارەکان دەبنە خۆشی ... وە ناخۆشییەکان دەبنە تام و چێژ .. وە گریانەکان دەبنە ئاواز .. وە خوێنەکان دەبنە مسك و تامێکی خۆش .

ولَئِنْ عُذِّبْتُ يا ربُّ في الأرْضِ

فَبَيِّضْ وَجْهِي يومَ العَرْضِ

واتە: پەروەردگارا ...ئەگەر لە زەویدا ئازار درام

ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووم سپی بکە.

لەو کاتەدا خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت بە بینینی .. وە ئازارەکان دەبنە خۆشی .. پلە و پایەی بەرز دەبێتەوە .. وە لە هەڵەکانی خۆش دەبێت .. وە ڕەنگە خوای گەورە پێی بڵێت: ئەی بەندەکەم .. لە نێو خۆشگوزەرانیدا بمێنەوە چۆن خۆت حەزی لێ دەکەیت .. ئەمڕۆ خۆشییەکت پێ دەبەخشم

هـەرگیز ناخۆشـی بـە دوایـدا نییـە .. وە موڵکێکـت پـێ دەدەم هـیچ کـەس شەریکت نابێـت .. وە فریشـتەکان لـە هـەموو دەرگاکانـەوە پێشوازیت لـێ دەکەن .. وە خۆشـگوزەرانی لـە بـەر دەسـتتدایە..وە لای ئێمـەیش زیـاترو زۆرتر هەیە .. وە خۆشی و ئارامی هەیە.. ئای ی ی ی.. چەند خۆشـە ئـەو گفتوگۆیە .. ! ! لەگەڵ خوای دونیا و دوارۆژدا ..

﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ (٥٥) هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَـالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ(٥٦) لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ (٥٧) سَلَامٌ قَوْلًا مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ (٥٨)﴾ [سورة يس] .

واتە: بە راستی ئەمڕۆ بەهەشتییەکان لەناو خۆشی و شادی و کامەرانییەکی بێ وێنەدا سەرگەرمن * خۆیـان و هاوسـەرانیان لـە ژێـر سـێبەری درەخـتی جـوان و چـڕوپڕدا لەسـەر کورسـی و قەنەفـە رازاوەکـان شـانیان داداوە * میوەهـاتی و زۆرو جـۆراو جۆریـان لەوێـدا پێـشکەش دەکرێـت، هـەروەها هەرچی داوای بکەن و حەزی لێبکەن دەستبەجێ ئامادەیە ( لـە خـواردن و خواردنەوە، لە جل و بەرگی جوان، لە جێگەو رێگەی خۆش، لە هۆکاری هاتوچۆ، لە هەزاران ناز و نیعمەتی بێ ژومار) *

هاوڕێ لەگەڵ سڵاو و رێزدا لە لایەن پەروەردگاری میهرەبان و دڵۆڤانەوە .

بـەڵێ ..لـە خودایـەکی میهرەبانـەوە کـە ژیـانی دڵـەکان پەیوەسـتن بـە خۆشەویستی ئەوەوە .. وە ئارامی دەروونەکان بەندن بە ناسینی ئەوەوە.. وە پشووی جەستەکان لە گوێڕایەڵی ئەودایە .. وە تام و چێژی روحەکان بە خزمەتکردنی ئەوەوە بەندن .. وە پێگەیشتنی زمانەکانی بەندن بە سوپاس

گوزاری و یادی ئەوەوە .. وە بە عیزەت راگرتنی نەفسەکان بەندن بە بەندایەتی و سوپاس گوزاری ئەوەوە وە ئەوانەی یادی خوای گەورە دەکەن ئەوان لە رۆژی دواییدا بە خوای گەورە دەگەن .. وە ئەهلی گوێڕایەڵی ئەهلی رێزداری ئەون .. بەڵام ئەهلی سەرپێچی هیچ پشکێکیان نییە لە میهرەبانی ئەو .. ئەگەر تەوبە بکەن ئەوا خۆشەویستی ئەون .. وە ئەگەر تەوبە نەکەن ئەوا ئەو پزیشکی دەردی ئەوانە .. بە جۆرەها بەڵا توشیان دەکات ..بۆ ئەوەی لە تاوانەکانیان خۆش بێت ..

﴿الم (١) أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ (٣) أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَاء مَا يَحْكُمُونَ (٤) مَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٥) وَمَن جَاهَدَ فَإِنَّمَا يُجَاهِدُ لِنَفْسِهِ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ (٦) وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ (٧)﴾ [سورة العنكبوت] .

واتە: ئایا خەڵکی وایانزانیووە: وازیان لێ دەهێنرێت کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لە کاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوەو تووشی سزاو ئازار نەکرێن؟ * سوێند بە خوا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی راستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون * ئایا ئەوانەی خراپە و نادروستی دەکەن وادەزانن کە لە دەستمان دەردەچن و دەربازدەبن؟! ئای چەند خراپە ئەو

بڕیارە کە دەیدەن * ئەوەی کە ئاواتەخوازە بە دیداری خوا شاد ببێت، با دڵنیا بێت کە کاتی دیاریکراوی خواو ساتی سەرەمەرگ هەردێت (تا بە دیداری شاد ببێت)، ئەو خوایە زۆر بیسەرە (بە گوفتاری بەندەکانی) و زانایە بە حاڵیان * ئەوەیشی کە هەوڵدەدات و کۆشش دەکات لە پێناوی گەیاندنی ئایینی خوادا: بێگومان قازانج و سوودی هەوڵ و کۆششەکەی هەر بۆ خۆیەتی، چونکە بە ڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکی * ( **بەڵام لە قیامەتدا ئەو زاتە زۆر سوپاسگوزاری ئەو کەسانەیە کە هەوڵ و کۆششیانداوە لە پێناوی ئایینەکەیدا)** * ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بە ڕاستی هەڵەو گوناهەکانیان دەسڕینەوەو بە چاکتر لەوەی کە دەیانکرد پاداشتیان دەدەینەوە .

---

هەندێ خەڵکی هەن لە ناخەوە حەز لە هیدایەت دەکەن بەڵام خۆبەزل زانین ڕێگر دەبێت لە شوێن کەوتنی ڕێنمایەکانی ئەم دینە.. بەڵێ خۆی بەزل دەزانێ بەوەی جلەکەی کورت بکاتەوە تا سەر قاپەڕەقەی یاخود ریشی بهێڵێتەوە و جیاوازی بکات لەگەڵ بێ باوەڕاندا.. چونکە هەندێ کەس جوانی دیمەنی خۆی لە گوێڕایەڵی خواکەی لا گەورەترە... و هەروەها هەندێ ئافرەت ...خۆ پۆشتەکردن بەکەم دەزانێ چونکە ئەو سوورە لەسەر خۆجوان کردن و جوان ڕاگرتنی جل وبەرگەکەی ... یاخود سەرپێچی خواکەی دەکات بە ڕێکخستنی برۆکەی ...یان تەسك کردنی جل وبەرگەکەی.. وە ئەگەر کەسێك ئامۆژگاری بکات ئەوا خۆی بەزل دەزانی

وگوێڕایەڵ نابێت ...وە هەرکەسێ یەك زەڕڕە تەکەبوری لەدڵدا بێت ئەوا ناچێتە بە هەشتەوە ... ئەی چۆنە ئەگەر هاتوو ئەو تەکەبورە ڕێگربێت بەرامبەر هیدایەت دانی...؟؟؟؟!

(جبله)ی کوڕی (الایهم) ......

پادشایەك بوو لە پادشاکانی غەسان، ئیمان چوو بووە دڵییەوە ...بۆیە موسڵمان بوو... نامەیەکی نووسی بۆ ئیمامی (عمر) ﷺ کە خەلیفەی موسڵمانان بوو ...داوای لێ دەکرد ڕێگەی بدات چونکە ئەم دەیەوێ بڕوات بۆ لای .. ئیمامی (عمر) ﷺ و موسڵمانان زۆر خۆشحاڵ بوون بەو هەواڵە... ئیمامی (عمر) ﷺ بۆی نووسی: ئێمە لە پێشوازی ئەوداین ..ئەو ئەرکانەی لەسەر ئێمە دەبێت لەسەر ئەویش دەبێت و ئەو مافانەی بۆ ئێمە هەیە بۆ ئەویش هەیە... پاشان (جبله) کەوتە ڕێ لەگەڵ پێنج سەد سواردا لە کەسوکاری خۆی.. کە نزیك شاری (مەدینە) بووەوە جلوبەرگێکی لەبەرکرد لە ئاڵتون دروستکرابوو .. وە تاجێکی لەسەرنا بە گەوهەر داپۆشرابوو.. هەروەها سەربازەکانی جوانترین جلوبەرگیان لەبەر کرد .. پاشان چوونە ناو شاری مەدینەوە.. هیچ کەس لەشاردا نەما هەمووی هاتبوون بۆ تەماشاکردنی ئەو، تەنانەت ئافرەت و منداڵەکان، کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ لای خەلیفەی موسڵمانان، (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ پێشوازی لێ کردو لەخۆی نزیکی کردەوە .. کاتێ مەوسمی حەج هات .. ئیمامی عومەر ﷺ چوو بۆ حەج .. هەروەها (جبله) لەگەڵیدا دەرچوو، لەو کاتەدا کە (تەوافی) دەکرد .. کابرایەکی هەژار کە لە(بەنی فەزارە) بوو ..پێی نا بەسەر

جلوبەرگەکەی (جبلە)دا .. بۆیە (جبلە) بە تووڕەییەوە رووی لێ کردو زلەیەکی لێ داو، لوتی شکاند .. کابرای (الفزاری) پەست بوو، سکاڵای خۆی برد بۆ لای (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ ئەویش ناردی بە شوێنیداو پێی گوت: ئایا چی وای لێت کردووە لە کاتی تەوافدا بدەی لە براکەی خۆت .. و لوتی بشکێنی !..؟.. ووتی: ئەو پێی نا بەسەر جل وبەرگەکەمدا.. ! وە ئەگەر لەبەر حورمەتی کەعبە نەبوایە ئەوا لە ملی ئەوم دەدا .. ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: ئەوا خۆت دانت بەتاوانەکەی خۆتدا نا .. یان ئێستا رازی دەکەیت یان دەبێ تۆڵەی ئەوت لێ بکەینەوە .. ووتی: تۆڵەم لێ دەسێنن؟ لەکاتێکدا من پادشام و ئەو کابرایەکی ئاساییە؟ ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئەی (جبلە) ئیسلام تەماشای تۆ و ئەو وەك و یەك دەکا .. هەموو خەڵکی یەکسانن .. رێزی کەس لەکەس زیاتر نییە تەنها بە (تەقوا) نەبێت، (جبلە) ووتی: کەواتە دەگەڕێمەوە سەر دینەکەی خۆم و دەبمە گاور (نصاری)، ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوە دەبێ بکوژرێت، ئەگەر ببیتە گاور ئەوا دەدرێت لەملت..

جبلە ووتی: کەواتا تاکو سبەی مۆڵەتم بدە ئەی پێشەوای ئیمانداران .. ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: چۆنت دەوێ با وا بێت ... کە شەو بەسەردا هات (جبلە) و هاوڕێکانی لە مەککە دەرچوون و چوون بۆ (قستەنتینیە) و لەوێ بوونە گاور .. سەردەمێك بەسەریدا تێپەڕی .. تام و چێژەکانی ژیان رۆیشت ... تەنها پەشیمانی مایەوە .. رۆژگاری موسڵمان بوونی کەوتەوە یاد .. تام و چێژی نوێژ و رۆژووی کەوتەوە یاد .. بۆیە پەشیمان بووەوە کە

وازی لەو دینە پاکە هێنا .. وە پەشیمان بووەوە لەوەی کە هاوەڵی بۆ خوای گەورە داناوە.. پاشان دەستی بەگریان کرد و ووتی:

| | |
|---|---|
| تنصرت الأشراف من عار لطمة | وما كان فيها لو صبرت لها ضرر |
| تكنفني منها لجاج ونخوة | وبعت لها العين الصحيح بالعور |
| فياليت أمي لم تلدني وليتني | رجعت إلى القول الذي قال لي عمر |
| يا ليتني أرعى المخاض بقفرة | وكنت أسير في ربيعة أو مضر |
| وياليت لي بالشام أدنى معيشة | أجالس قومي ذاهب السمع والبصر |

واته:

شکۆدارەکان بوون بە گاور لە شەرمەزاری زلەیەك

چی زیانێکی تیادا بوو ئەگەر ئارامت بگرتایە

دووری خستمەوە لێی بت و بۆڵە و غیرەت

وە چاوی ساغم فرۆشت بە کوێری

خۆزگە دایکم منی نەبوایە و خۆزگە

دەگەڕامەوە بۆ ئەو قسەی کە عمر ﷺ پێی ووتم

خوزگە شوانیم بکردایە لە دەشتاییەکدا

وە لە ربیعە و مضر ڕێگام بگرتایە

وە خۆزگایە لە (شام) کەمترین ژیانم بوایە

دابنیشتمایە لە نێو خزماندا بە کەڕ و کوێری

پاشان لەسەر گاوری خۆی مایەوە تاکو مرد، بەڵێ .. مرد لەسەر کوفر .. چونکە تەکەبوری بوو بەوەی کە زەلیل بێت بەرامبەر شەرعی خوای گەورە.

هەرکەسێ خۆشگوزەرانی هەتا هەتایی بوێت .. ئەوا با دەست بگرێت بە دەرگای بەندایەتییەوە .. وە با بۆ خواکەی خۆی ملکەچ و گوێڕایەڵ و زەلیل بێت .. لەبەر دەستیدا سوژدە ببات .. وە خۆی لەو نزیك بکاتەوە .. وەڵامی فەرمانەکانی بداتەوە .. پشت لە قەدەغەکراوەکانی بکات .. خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٢٤) وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٢٥)﴾
[سورة الأنفال] .

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامەو ڕێبازێك کە دەتانژێنێتەوەو ژیانبەخشە، چاك بزانن بە ڕاستی خوا (زۆر بە ئاسانی) دەتوانێت دەسەڵاتی بکەوێتە نێوان ئادەمیزادو (ئاواتەکانی) دڵیەوە (بە گۆڕینیان)، (بیرتان نەچێت) بە ڕاستی هەر بۆ لای ئەویش کۆ دەکرێنەوە * هەروەها خۆتان بپارێزن لە بەڵایەك کە تەنها تووشی ئەوانەتان نابێت کە ستەمیان کردوە (بەڵکو هەمووان دەگرێتەوە)، بیشزانن کە بەڕاستی خوا تۆڵەی زۆر بە زەبرە

.

وە ڕەنگە هەندێ کەس حەزی لە هیدایەت هەبێت .. وە ماوەیەك لەسەر ئەو هیدایەت دانە بڕوات .. پاشان بە خۆشییەکانی دونیا مەغرور دەبێت .. بە ڕوویەك لەناو خەڵکیدا هەیبێ .. یان بە کارێك .. یان بە سەروەت و سامان..

یان بە خۆشەویستی و هاوڕێتی کەسانێك.. بۆیە واز لە دینەکەی دەهێنێت .. یان کۆمەڵێك لە هاوەڵانی لـە دەوری کۆ دەبنـەوەو شـەهەواتی لا جـوان دەکەن.. وە بانگەوازی دەکەن بۆ تام و چێژی دونیا .. ئەویش لە گەڵیانـدا شەریك دەبێت .. وە لەسەر سەرپێچییەکەیان بێ دەنگ دەبێت .. بۆیـە لـە عیززەتی گوێڕایەڵییەوە دەڕوات بۆ زەلیلی سەرپێچی .. بۆیـە لـە دینەکـەی هەڵدەگەڕێتەوە لە پاش ئەوەی خوای گەورە هیدایەتی دابوو.

لە هەردوو کتێبی ( صحیح) دا هاتووە .. کابرایەك هەبوو قورئانی دەنوسـی و دەخوێندەوە .. یەکێك بوو لەوانـەی قورئانیـان دەنوسـی بـۆ پێغەمبـەری خوا ﷺ .. وە سـورەتی (البقرة) و(آل عمران) ی لەبەر کردبوو .. وە لـەو کاتەدا هەر کەسێ سورەتی (البقرة) و(آل عمران)ی لەبـەر بوایە ئـەوا ڕێـزی لەناو هاوەڵاندا بەرز دەبووەوە .. بێ باوەڕان مەغروریان کرد .. بە دونیا .. بـە سـەروەت و سـامان .. بـە ئـافرەت .. بۆیـە لـە ئیـسلام هەڵگەڕایـەوە و پەیوەنـدی کـرد بــە بـت پەرسـتانەوە .. بـۆ ئـەوەی ئـەو خۆشـییەی دەستکەوێت.. پاشان دەستی کرد بە گاڵتە کردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ.. و دەیووت: (محمد) هـیچ نازانێـت تـەنها ئـەوە نـەبێت کـە مـن نوسـیومە .. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەواڵەی پێگەیشت ..فەرمووی:

(اللهم اجعله آية)..

واتە: پەروەردگارا ... ئەو کابرایە بکە نیشانەو پەند بۆ خەڵکانی تر.

پاش ماوەیەکی کەم کابرا مرد .. بەڵێ مرد .. وە تام و چێژەکانی دونیا بڕا .. تەنها پەشیمانی مایەوە .. و تاوانەکان گەورەو مـەزن بوونـەوە .. کـاتێ

مرد .. گۆڕێکیان بۆ کردو ناشتیان .. کە سبەینێ ڕۆژ بووەوەو بە تەنیشت گۆڕەکەیدا تێپەڕین .. بینیان لاشەکەی فڕێ دراوەتەوە دەرەوە .. بینیان جەستەکەی لە سەر گڵەکە کەوتووە .. سەرسام بوون !! چۆن لە گۆڕەکەی دەرهێنراوە؟! وتیان: ئەمە کردەوەیەکە لە کردەوەکانی (محمد) و هاوەڵانی .. جارێکی تر چاڵیان بۆ کردو پاشان زۆر قوڵیان کرد .. پاشان ناشتیان .. کە سبەینێ ڕۆژ بووەوە .. بە تەنیشت گۆڕەکەیەوە تێپەڕین .. بینیان دیسان زەوییەکە فڕێی داوەتە دەرەوە .. دیسان وتیان: ئەمە کردەوەیەکە لە کردەوەکانی (محمد) و هاوەڵانی .. دیسان گەڕانەوەو چاڵیان بۆ کردو زۆرتر قوڵیان کرد تاکو توانیان .. ناشتیان .. بۆ سبەینێ .. بە تەنیشت گۆڕەکەیدا تێپەڕین .. بینیان زەوی فڕێی داوەتە دەرەوە .. بۆیە وتیان: ئەمە کاری مرۆڤ نییە .. لەو دەشتە بە سووکێکەوە بە جێیان هێشت .. لەسەر ئەو زەوییە .. سەگ بە تەنیشتییەوە تێدەپەڕی پێیەکانی بەرز دەکردەوەو میزی دەکرد بەسەریدا .. وە ڕێوی بە جەستەکەی یاری دەکردو پارچە پارچەی دەکرد .. وە قەلە ڕەش لە جەستەکەیان دەخوارد.. (پەنا دەگرین بە خوا لە گومڕایی لە پاش هیدایەت و ڕێنموویی..)، وە هەندێ کەس هەن ماوەیەك لەسەر گوێڕایەڵی دەمێنێتەوە وە لەگەڵ خواکەی خۆیدا دەحەسێتەوەو ئارام دەگرێت .. بە موناجاتی خوا تام و چێژ وەردەگرێت .. وە دڵی دەژێتەوە بە خۆشەویستی خوداوە .. وە ناخی ئارام دەگرێت بە ناسینی ئەوەوە .. بەڵام ئەهلی سەرپێچی و شەهەوات دەبینێ .. حەزو ئارەزوو دەکات ئەو ژیانەی ئەوان تاقی بکاتەوەو

لەگەڵیاندا خۆشگوزەران بێت .. وا دەزانێ ئەوانە لە ژیانێکی خۆشدان .. پاش ماوەیەك بۆی دەردەكەوێت كە ئەوان لە ناخۆشی و بەڵادان ..

ابن الجوزی لە کتێبی (المنتظم) دا باسی کردووەو دەڵێت:

موسڵمانان هێرشیان کردە سەر قەڵایەك لە قەڵای رۆمەکان .. قەڵایەکی زۆر سەخت بوو .. گەمارۆی قەڵاکەیان دا بۆ ماوەیەکی زۆر و رێگایان لێ گرتبوو.. لە کاتی گەمارۆکەدا ئافرەتێکی رۆمی لە قەڵاکەوە سەری دەرهێنا، کابرایەکی موسڵمان بە ناوی ( ابن عبد الرحیم) ئەوی بینی و پێی سەرسام بوو ..وە دڵی پەیوەست بوو بە ئەوەوە .. بۆیە نامەیەکی بۆ نارد: چۆن پێت بگەم؟؟

ئەویش وتی: ببیتە گاورو سەرکەویتە سەرێ ..

ئەویش بووە گاورو چووە سەرەوە ... چەندە هەژارە ..!! وا دەزانێ بەختەوەری لە ئافرەتێکدایە کە بیخوازێ .. یان عارەق بخواتەوە .. کاتێ موسڵمانان ئەویان بزر کرد .. زۆر بۆی غەمبار بوون ..

ماوەیکی زۆری پێ چوو نەیانتوانی قەڵاکە رزگار بکەن .. بۆیە رۆیشتن .. پاش ماوەیك کۆمەڵێك لە موسڵمانان بە تەنیشت قەڵاکەوە تێپەڕین (ابن عبد الرحیم)یان کەوتە یاد .. بۆیە پرسیاری ئەویان کرد .. وە ئایا ئێستا خەریکی چییە؟ بە ناوی خۆیەوە بانگیان کرد: ئەی ابن عبدالرحیم ... ئەویش سەری دەرهێنا .. وتیان: ئەوەی ویستت دەستت کەوت؟ کوا قورئانەکەت؟؟ کوا عیلمەکەت؟؟ ئەی نوێژەکانت چی لێ کرد؟؟

وتی: هەموو قورئانم لە بیر چووەتەوە .. وە هیچ ئایەتێکم لە بیر نییە تەنها یەك ئایەت نەبێت ... ئەویش ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ (٢) ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ (٣) ﴾ [سورة الحجر] .

واتە: ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون ( لە ئایندەیەکی نزیکدا) ئاواتەخواز دەبن کە خۆزگە موسڵمان بوونایە، خۆزگە ئیمانداربوونایە * (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) جارێ وازیان لێ بهێنە با بخۆن و رابوێرن‌و هیواو ئاواتیان سەرگەرم و بێئاگایان بکات، سەرەنجام خۆیان دەبیننەوە (چیان بەسەر دێت) .

ئەمە هەواڵی (ابن عبد الرحيم) بوو .. بە خشتەی ئافرەتێك هەڵخەڵەتا .. لەو پێناوەدا هاوەڵی بۆ خوای زەوی و ئاسمانەکان دانا ..

وقد يغري المرء بالمال　　　فيكفر بالكريم المتعال

واتە: رەنگە هەندێ کەس بە سەروەت و سامان مەغرور ببن .. بۆیە کوفر دەکەن بە خوای گەورەو باڵادەست ..

تەماشای (الأعشى ی کوڕی قیس) بکەن .. کابرایەکی بە تەمەنی شاعیر بوو.. لە ناوچەی (نەجد)، لە شاری (یەمامە) وە دەرچوو، رۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەبەستی ئەوەی ببێتە موسڵمان .. سواری وڵاخەکەی بوو .. تامەزرۆی بینینی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بەڵکو لە رێگادا لەبەر خۆیەوە شیعری بە باڵای پێغەمبەری خوادا ﷺ دەووت و دەیفەرموو:

ألم تغتَمِضْ عيناكَ ليلةً أرمَدَا وبتَ كَمَا باتَ السَّليمُ مُسَهَّدَا

ألا أيا هذا السائلي أينَ يَمَّمتَ فَإنّ لَها في أهْلِ يثْرِبَ مَوْعِدَا

وآليتُ لا آوي لها من كَلالَةٍ ولا من حفيٍّ حتّى تُلاقي مُحمّداً

نَبيٌّ يَرَى مَا لا تَرَوْنَ و ذِكْرُه أغَارُ لَعَمْرِي فِي البلادِ و أنجَدَا

أجَدِّكَ لم تسمَعْ وَصَاةَ محمَّدٍ نبيُّ الإلهِ حيثُ أوصَى و أشْهَدَا

إذ أنت لم تَرحَل بزادٍ مِن التُّقَى ولاقَيْتَ بعدَ الموْتِ مَن قَد تَزَودَا

نَدِمتَ عَلى أن لا تَكُونَ كَمثْلِه فتَرصُدَ للأمرِ الذِي كانَ أرصَدَا

واتە: ئایا چاوەکانت لە شەوێکدا لەبەر ئێش و ئازار بە یەك نەنا

وە شەو مایەوە وەکو کەسێکی مارو دووپشك پێوەدراو خەو زڕ بوو بێ

ئەی ئەو کەسەی کە پرسیارم لێ دەکەیت مەبەستت کوێیە

چونکە ئەو لەگەڵ خەڵکی (یثرب) دا بەڵێنێکی هەیە

بەردەوام بوو لە برینی بیابانەکان ... لە ڕێگادا هەردەم دڵی لای بینینی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ .. چونکە بە دڵ ئارەزووی بوو ببێتە موسڵمان و رقی لە بت پەرستی بوو .. کاتێ نزیکی شاری مەدینە بووەوە لە ڕێگادا کۆمەڵێك لە بێ باوەڕان ڕێگایان پێ گرت و لێیان پرسی: بۆ چی مەبەستێك هاتووی؟ ئەویش بەوانی ڕاگەیاند کە هاتووە بۆ بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ و ببێتە موسڵمان .. بۆیە ئەوان ترسان کە (الأعشى) ببێتە موسڵمان، چونکە شاعیرێکی بە توانایەو دەبێتە پشت و پەنایەك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .. ئەوەتا تەنها شاعیرێك کە (حسان ی کوڕی ثابت) ﷺ ئەو هەموو

کردارەیان پێ دەکات .. ئەی باشە چۆن دەبێت ئەگەر هاتوو شاعیرێکی گەورەی عەرەب کە (الأعشى ی کوڕی قیس)ە ببێتە موسڵمان؟؟

وتیان: ئەی (أعشی) دینەکەی خۆت و باوك باپیرت باشترە ..

ووتی: بەڵکو دینەکەی ئەو باشترو راستترە .. بۆیە هەموویان تەماشای یەکیان دەکردو پرسیان بە یەك دەکرد بۆ ئەوەی بە هەر هۆکارێك بێت رێگە لەم کابرایە بگرن و نەبێتە موسڵمان .

ووتیان: ئەی (أعشی) ئەی نازانیت (محمد) زینای حەرام کردووە؟..

ووتی: من پیرەمێردێکی بە تەمەنم .. هیچ پێویستیم بە ئافرەت نەماوە ...

ووتیان: ئەو عارەقی حەرام کردووە ..

ووتی: بە راستی عارەق دەبێتە هۆی رۆیشتنی عەقڵ .. وە پیاو زەلیل دەکات .. هیچ پێویستیم پێی نییە .. کاتێك بینیان ئەو سوورە لەسەر چوونە ناو دینی ئیسلامەوە ..

ووتیان: سەد وشترت دەدەینێ بە مەرجێك بگەڕێیتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆت و واز لە ئیسلام بهێنی .. پاشان (أعشی) دەستی کرد بە بیرکردنەوە دەربارەی ئەو هەموو سەروەت و سامانە زۆرە .. بینی بە راستی سامانێکی گەورەیە .. بۆیە شەیتان زاڵ بوو بە سەریدا .. رووی لێیان کردو ووتی: ئەگەر سەروەت و سامان بێت ئەوا بەڵێ ... ئەوانیش سەد وشتریان بۆ کۆ کردەوەو ئەویش بردی و بە کافری گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کاری خۆی.. وە هەموو ئەو وشترانەی پێش خۆی خست ... زۆر بە خۆشحاڵی و

دڵخۆشییەوە .. بەڵام کاتێك نزیك ماڵەوە بووەوە لە وشترەکەی کەوتە خوارەوەو ملی شکاو مرد ...

﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّواْ الْحَيَاةَ الْدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ وَأَنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ(١٠٧) أُولَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ (١٠٨) لاَ جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمُ الْخَاسِرونَ (١٠٩)﴾ [سورة النحل].

واتە: ئەو خەشم و قینەش لەبەر ئەوەیە چونکە بە راستی ئەوانە ژیانی دونیایان خۆشتر ویستووە لە ژیانی دوارۆژ، بێگومان خوا هیدایەتی قەوم و کەسانی بێ باوەڕ و خوانەناس نادات * ئەو جۆرە کەسانە، ئەوانەن کە خوا مۆری ناوە بە سەر دڵ و دەروون و دەزگای بیستن و بینینیانداو ئەوانە غافڵ و بێئاگان (لە حەقیقەت و راستییەکان)* شتێکی راستەو گومانی تێدا نییە ئەوان لە رۆژی قیامەتدا خەسارەتمەندو ریسواو زەرەرمەندن .

وەئەگەر دەتەوێت دڵنیا بیت لە ئاخر شەڕی هاوڕێتی خراپەکاران و داوێن پیسان .. ئەوا تەماشای (عبیداللە ی کوڕی جەحش) بکە .. یەکێك بوو لەوانەی هاوڕێتی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکردو لە مەجلیسەکانیدا دادەنیشت .. بەڵکو یەکێك بوو لەوانەی کە لە پێناوی دینەکەیدا ئازار دەدراو لە مەککە ژیانی لێ تەنگ کرا بوو .. بۆیە لەگەڵ موسڵماناندا کۆچی کرد بۆ حەبەشە .. کەس و کارو وڵاتی خۆی بە جێهێشت .. سەروەت و سامانەکەی و خانووەکەی ... لە پێناوی خوادا .. وە (أم حبیبە)ی خێزانی لەگەڵدا بوو.. لەوێ تێکەڵ بوونی لەگەڵ گاورەکاندا زیادی کرد.. و لە

موسڵمانان دوور کەوتەوە .. ئەو لەسەر ئەو حاڵەیە مایەوەو بەردەوام بوو..
تاکو رۆژێکیان بە (أم حبيبه) ی خێزانی ووت: من تەماشای هەموو دینەکانم کردووە هیچ دینێکم نەدیوە کە لە دینی گاور(نەصرانییەت) باشتر بێت .. ئەویش ترسا .. ووتی: سوێند بە خوا ئەو قسەیە هیچ باش نییە بۆ تۆو لە خوا بترسە .. ئەویش هیچ گوێی بە قسەی خێزانەکەی نەدا .. بەڵکو کوفری بە خوا کردو خاچی (صليب) ی لەسەر سینگی خۆی هەڵواسی .. وە دەستی کرد بە خواردنەوەی عارەق ... وە تێکەڵ بوونی گاورەکان .. تاکو مرد .. داوا لە خوا دەکەین دامەزراومان بکات لەسەر دینەکەی تاکو مردن..
وە هەر لەبەر مەزنی هاوڕێتی لە سەر دامەزراو بوون لەسەر ئەم دینە .. خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئافرەتان و پیاوانی موسڵمانان .. بە دەست گرتن و هاوڕێتی چاکانەوە لە پیاوان و ژنان .. وە وریای کردوونەتەوە لە حاڵی جگە لەوان .. خوای گەورە دەفەرمووێت:
﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا (٢٧) وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا (٢٨)﴾ [سورة الكهف].
واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بە سروش رەوانە کراوە بۆ تۆ، لە قورئانی پەروەردگارت بیخوێنەرەوەو دەوری بکەرەوە، هیچ کەس نییە فەرموودە و گوفتاری ئەو زاتە بگۆڕێت، دڵنیاشبە کە هەرگیز پەناگاو یاریدەدەرێکی وەکو ئەو زاتەت دەست ناکەوێت * ئارام بگرەو خۆت رابگرە

لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا، مەبەستیانەو دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان رازی بکەن، روو لەوان وەرمەگێڕەو ( روومەکە دونیا پەرستان و دەوڵەمەندان) لە کاتێکدا تۆ زینەت و رازاوەیی ژیانی دونیات بوێت و بە قسەی ئەو جۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لە یادی خۆمان (بە هۆی دونیا پەرستییەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووەو هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنەو لە سنوور دەرچووە .

وە ئەوەی کە زیاتر ئیماندار سوور دەکات لەسەر دینەکەی و دامەزراوتری دەکات ئەوەیە کە خەمی ئەم دینە هەلگرێ .. دەبێت هەردەم کاریگەری لەسەر سەرپێچی کاران هەبێت و ئەوان کاریگەریان بە سەرییەوە نەبێت .. ئامۆژگاری ئەم بکات و تەمێی ئەو بکات .. وە فەرمان بکات بە چاکە و نەهی بکات لە خراپە .. بانگەواز بکات بە کاسێتی سوود بەخش .. یان کتێبێکی کاریگەر .. یان ئامۆژگارییەکی راستگۆیانە .. بۆ ئەوەی ئیمانی زیاد بکات لەسەر ئیمانەکەی خۆی .. وە بەردەوام بوونی لەسەر دینەکەی بە هێزتر بێت ..

وە تەماشای چیا بەرز و بڵندەکان بکە ... وە هەنگاوە دامەزراوەکان .. تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە .. تەماشای أبو بكر بکە .. وە تێبڕوانە بۆ سوور بوونی لەسەر بانگەواز بۆ دینی خوا .. وە سەرسام بە بەهێزی دامەزراو بوونی لەسەر دینەکەی ..

ابن سعد لە کتێبی ( الطبقات) باسی کردووەو ئیمامی الطبري لە (الریاض النضرة) دەڵێن:

لە سەرەتای دەست پێکردنی بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککەی پیرۆز بە نهێنی بانگەوازی بۆ ئیسلام دەکرد .. وە موسڵمانان دینەکەی خۆیانیان دەشاردەوە .. کاتێ ژمارەیان گەیشتە سی و هەشت کەس .. أبو بکر ﷺ داوای دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەواز ئاشکرا بکات .. خۆشەویستﷺ فەرمووی: (ئەی أبو بکر .. ژمارەمان کەمە) .. ئەوە بوو (أبو بکر) ﷺ بەردەوام داوای لێدەکرد .. تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ مزگەوت و موسڵمانان لەگەڵیدا دەرچوون .. وە لە مزگەوتەکەدا بڵاو بوونەوە .. هەر پیاوێك چوو بۆلای هۆزەکەی خۆی .. وە(أبو بکر) ﷺ لە نێو خەڵکیدا هەستا وەکو وتاربێژێك .. ئەوەبوو ئەو بووە یەکەم وتاربێژ بانگەواز بۆ خوا بکات .. کاتێ کە بێباوەڕان بینییان کەوا کەسێك هەیە گاڵتە بە خواکانیان دەکات و لە دینەکەیان کەم دەکاتەوە .. هەستان لە دژی أبو بکر ﷺ و موسڵمانان .. بۆیە دەستیان کرد بە لێدانی ئەوان لە مزگەوتدا .. بە لێدانێکی سەخت .. أبو بکریشﷺ بەردەوام بوو لە ئاشکرا کردنی دینەکەی .. بۆیە کۆمەڵێك لەوان دەوریان لێگرت و دەستیان بە لێدانی کرد .. تاوەکو کەوتە سەر زەوی .. لەکاتێکدا ئەو کابرایەکی بە تەمەنە .. تەمەنی گەیشتووەتە نزیکەی پەنجا ساڵ .. (عوتبەی کوڕی رەبیعە) یەکێك بوو لە هاوبەش بڕیاردەرەکان لێی نزیك بووەوە بە پێ چووە سەر سنگی و سکی و بە پێڵاوەکەی لێی دەدا .. وە

دەیدا لە دەم وچاوی تاکو گۆشتی ڕوومەتیان بچڕاند و بریندایان کرد .. خوێن بە ڕوویدا هاتە خوارەوە .. تاکو ڕوومەتی و لوتی لەیەك نەدەکرایەوە.. أبوبکریش ﷺ بوراوەتەوە، پاشان هۆزی (بەنی تیم) کە هۆزی أبو بکر بوون هاتن .. پێشوازیان لێکرد و بێ باوەڕانیان لێ دوور کردەوە، پاشان بە کەلوپەلەکەی خۆی هەڵیان گرت .. گومانیان لە مردنی نەبوو .. یەکەم وشە کە بە زاریدا هات ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی بەسەرهات؟

باوکی پەست بوو، دەستی کردە جوێن دان و لە ژوورەکە دەرچووە دەرەوە .. دایکی لەسەر سەری دانیشت .. هەوڵ دەدات نان و ئاوی بداتێ.. هەوڵێکی زۆر .. کەچی ئەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چی بەسەر هات؟ ووتی: سوێند بە خوا هیچ زانیارییەك نازانم دەربارەی هاوڕێکەت .. ووتی: بڕۆ بۆ لای (دایکی جەمیل ی کچی الخطاب) .. پرسیاری ئەوی لێ بکە ..(دایکی جەمیل) ئافرەتێکی موسڵمان بوو .. دینەکەی خۆی ئاشکرا نەکردبوو ..دایکی لەماڵ چووە دەرەوە بۆلای (دایکی جەمیل)، ووتی: (أبو بکر) ﷺپرسیاری (محمدی کوڕی عبد الله) ت لێ دەکات ..(دایکی جەمیل) لەوە ترسا موسڵمان بوونی ئاشکرا بێت .. ووتی: نە (أبو بکر) دەناسم و نە (محمد) .. بەڵام ئەگەر پێت خۆشە پێکەوە دەچین بۆ لای کوڕەکەت .. ووتی: بەڵێ .. پێکەوە ڕۆیشتن .. کە چووە ژوورەوە بۆلای أبو بکر ﷺ.. بینی کەوتووە .. ڕوومەتی برینداد بووە .. خوێنی لێ دەڕژێ .. بۆیە دەستی بە گریان و کردو ووتی: سوێند بەخوا ئەو کەسانەی وایان لە تۆ

کردووە .. ئەهلی کوفرو خراپەکارین .. وە منیش تکام هەیە لای خوا تۆڵەی تۆیان لێ بکاتەوە .. أبو بکر ڕووی لێکردو خەریك بوو ئارامی نەمێنێ، ووتی: ئەی دایکی جەمیل .. پێغەمبەری خوا ﷺ چی بەسەر هات؟ دایکی جەمیل تەماشایەکی دایکی (أبو بکر)ی کرد .. چونکە هێشتا ئەو موسڵمان نەبوو .. لەوە ترسا نهێنی موسڵمانان لای بێباوەڕان بدرکێنێ .. دایکی جەمیل بە أبو بکری ﷺ ووت: ئەمە دایکتە گوێی لێمانە .. ووتی: گوێت لای ئەو نەبێت و بڵێ .. ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ساغ وسەلامەتە .. ووتی: ئەو لە کوێیە؟ ووتی: لەماڵی (أبي الأرقم)ە..

دایکی ووتی: ئەوا هەواڵی هاوڕێکەت زانی .. ئێستا بخۆو بخۆرەوە .. ووتی: نەخێر.. سوێند بێت لەسەرم نابێت تامی خواردن و خواردنەوە بکەم تاکو نەڕۆم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بە چاوەکانم نەیبینم .. بۆیە ئەوان هەوڵیان لەگەڵدا تاکو تاریك داهات .. خەڵکی هێور بوونەوە .. هەوڵی دا هەستێت .. بەڵام نەیتوانی .. دایکی و دایکی جەمیل بەیەکەوە یارمەتییان دا و هەڵیانساند .. ڕۆیشتن تاکو چوونە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ.. کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بینی .. باوەشی لێدا و دەستی کرد بە ماچ کردنی .. وە موسڵمانان باوەشیان پێدا کرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەزەیی پێدا هاتەوە .. أبو بکر ﷺ دەڵێت: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.. هیچ ئازارێکم نییە .. تەنها ئەو بێباوەڕە نەبێت کە ئازاری دەم و چاوی داوم .. پاشان أبو بکر ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.. ئەمە دایکمە لەگەڵ

ڕۆڵەکەیدا باشە .. وە تۆیش کەسێکی پیرۆزی .. بانگەوازی بکە بۆلای خوا.. وە دوعایشی بۆ بکە .. بەڵکو خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بکات.. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆکرد و پاشان بانگی کرد بۆلای خوا .. ئەویش موسڵمان بوو .. ئەم سووربوونە مەزنەی ابو بکر‌ؓ.. یەکەم بەرهەم لە بەرهەمەکانی ئەوە بوو کە خوای گەورە دامەزراوی کرد لەسەر ئەم دینە.. کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد . هەندێ لە هاوەڵان گومانیان کرد لە مردنی .. بۆیە (عمر)‌ؓ هەستا و شمشێرەکەی دەرهێناو هەڕەشەی دەکرد لەو کەسانەی بڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە.. لەو کاتەدا ابو بکر ؓ زۆر لەسەر خۆو هێمنانە بە هەنگاوێکی دامەزراوانە دەچێتە سەر مینبەر .. وە بە قسە شیرینەکەی ئەو کێشەیە چارەسەر دەکات و دەڵێت: (هەرکەسێ (محمد) ی دەپەرست ئەوا (محمد) کۆچی دوایی کرد، وە هەرکەسێ خوای گەورەی دەپەرست ئەوا خوای گەورە زیندووەو نامرێت) .

پاشان چەند هۆزێکی عەرەب لە دەورو بەری مەککە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە .. بۆیە ابو بکر بە روویاندا دەوەستێت .. بە دامەزراوی و بڕوایەکی بەتینەوە .. تاکو دیسان هێزو دەسەلاتی بۆ ئیسلام گەڕاندەوە .. بەڵکو لە بەرهەمەکانی ئەو سوور بوونە ئەوەیە کە زیاتر لە سی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون .. شەش لەوان لەو دە کەسەن کە موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە. وە دەبێت کچان و کوڕان .. بەڵکو پیاوان و ژنانی موسڵمانان .. ئەگەر یەکێك لەوان ئارەزو شەهەوتێك

هاتـە رێگـای .. یـان هەسـتی کـرد دڵـی رەق بـووە.. یـان هەسـتی کـرد لـە گوێڕایـەڵی دوور کەوتووەتـەوە .. وە حـەزی لـە قەدەغەکراوەکانـە .. شکایەتی خەمەکانی لای برایەکی دڵسۆزو دەست پـاك بکـات بـە مەبەسـتی ئامۆژگـاری کردنـی .. وە پێـشینان جـاری وا بـوو هەنـدێکیان بـە هەنـدێکی تریان دەووت: (تعال بنا نؤمن ساعة).
واتە: وەرە با ساتێك ئیمانمان تازە بکەینەوە.
ئیمامی (الترمذي) و (النسائي) بە سەنەدێکی (جیـد) ریوایـەتیان کـردووە .. کە (مرثد ی کوڕی أبی مرثد)ﷺ لە شاری مەدینە بە نهـێنی دەردەچـوو بـۆ شاری مەککە .. وە دەچووە ئەو ماڵانەی کە بەندییەکانی موسڵمانانی تیادا بەند کرابوو وە لە کۆتەکەیان دەربازیانی دەکردو لەگەڵ خۆیدا دەیـانی بـرد بۆ مەدینە .. شەوێك لە شـەوان چـووە نـاو شـاری مەککـەوە .. بـەڵێنی بـە یەکێك لە بەندەکان وەرگرتبوو لە جێگایەکدا یـەکبگرن .. لـە کاتێکدا ئـەو بەرەو ئەو جێگایە دەڕۆیشت .. ئافرەتێك لە ئافرەتـە خراپـەکانی مەککـەی بینی .. پێیان دەووت (عناق) کە لـە کـاتی نەفامیـدا هـاوڕێی بـوو .. کـاتێ ئەوی بینی خۆی لێ شاردەوە بەڵام (عناق) ئەوی بینی .. ئەویش بەرەو لای هات و تەماشای کرد و ناسییەوە ..
وتی: مرثد؟
مرثد ..
بەخێر بێیت .. فەرموو ئەمشەو لامان بمێنەوە ..
ووتی: ئەی (عناق) خوای گەورە زینای حەرام کردووە ...

ووتی: دەیکەیت یان ئابڕووت ببەم ..

ووتی: نەخێر ..

ئەویش هاواری کرد: ئەی چادرنشینەکان .. ئەم کابرایە هاتووەو دەیەوێ بەندییەکانتان دەرباز بکات .. بۆیە (مرثد) ﷺ ترساو هەڵات .. هەشت پیاو لە پیاوانی ئەوان شوێنی کەوت ..ئەویش چووە ناو باخچەیەکەوەو لە جێگایەکدا خۆی شاردەوە .. ئەوانیش چوونە ناو باخچەکەوەو خوای گەورە ئەوانی کوێر کرد و ئەویان نەبینی بۆیە گەڕانەوە جێگای خۆیان .. ماوەیەکی کەم لە جێگاکەی مایەوە . پاشان دەرچوو بۆ ئەو جێگایەی کە بەڵێنی بە هاوڕێکەی دابوو .. لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرت و بەڕێ کەوتن و لە مەککە دەرچوون .. هەموو کۆت و زنجیرەکەی لێ کردەوە تاکو گەیشتنە شاری مەدینە .. بەڵێ ... گەیشتنە مەدینە .. بەڵام دڵی هێشتا لای ئەو ئافرەتە مابوو .. بۆیە ئارامی نەگرت .. چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .. ئایا (عناق) مارە بکەم؟؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی لێ کرد .. بۆیە جارێکی تر پرسیاری لێ کردەوە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا (عناق) مارە بکەم؟؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو تاکو خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێت:

﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ (٣) ﴾ [سورة النور].

واتە: پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یا خود موشریك مارەی دەکات

(هاوسەرێتی پیاوان و ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرام کراوە .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و پێی ووت: ئەی مرثدﷺ .. پیاوی زیناکەر نابێت هیچ ئافرەتێك مارە بکات تەنها ئافرەتی زیناکەر یان موشریك نەبێت وە ئافرەتی زیناکەر نابێت هیچ پیاوێك مارەی بکات تەنها پیاوی زیناکەر یان موشریك نەبێت .. بۆیە تۆیش ئەو مارە مەکە[٥] ..

خوای گەورە لە مرپد رازی بێت .. ببینەو تەماشاکە، چۆن فریای خۆی کەوت بە پرسیار کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ تاکو ئەو وەسوەسەیەی کە شەیتان دەیویست لە خشتەی ببات لەسەری نەما ..

أبو نعیم لە کتێبی (حلیة الأولیاء) دا باس دەکات و دەڵێت:

لە (عەمری کوڕی مەیمون ی کوڕی مەهران) ەوە دەڵێت:

پاش ئەوەی باوکم تەمەنی گەورە بوو، وە چاوەکانی لە دەست دا .. پێی ووتم: کوڕم با بڕۆین بۆ لای (الحسن البصری) منیش لە ماڵ دەرم کرد و بەرەو ماڵ (الحسن البصری) بردم .. کاتێ چوینە ژوورەوە بۆ لای (الحسن البصری) باوکم پێی ووت: ئەی باوکی سەعید .. دڵم هەندێك رەق بووە .. داواکارم هەندێ نەرم و نیانیم پێ ببەخشی ..

الحسن ئەو ئایەتەی خوێندەوە کەخوای گەورە دەفەرموێت:

---

(٥) (رواه الترمذي وأبو داود، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح سنن الترمذي: ٣١٧٧، وصحيح سنن أبي داود: ٢٠٥١).

﴿أَفَرَأَيْتَ إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ (٢٠٥) ثُمَّ جَاءهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ (٢٠٦) مَـا أَغْنَى عَنْهُم مَّا كَانُوا يُمَتَّعُونَ (٢٠٧)﴾ [سورة الشعراء].

واتە: باشە ئايا ئەگەر چەندەها ساڵ مۆڵـەتیان بدەین و ژیـانی دونیـا بـە خۆشی ببەنە سەر، باوەڕ دەهێنن؟! * پاشان ئەگەر ئەو هەڕەشەو سزایەی کە لەوان کراوە هاتەدی و پێشهات، دەتوانن چی بکەن؟! * ئەوسا ئیتر ئەو رابواردنەی دونیایان هیچ فریایان ناکەوێت و بێ سوود دەبێت .

بـاوکم دەسـتی بـە گریـان کـرد .. تـاکو کەوتـە سـەر زەوی ... پاشـان بـە پێیەکانی دەیدا بە زەویدا.. هەروەکو چۆن مەڕێکی سەربڕاو پێیەکانی دەدا بە زەویدا .. وە (الحسن البـصری) ش لەگەڵیـدا دەسـتی بـە گریـان کـرد .. جارییەیەکی الحسن البصری هات و ووتی: بـە راسـتی ئـەو پـیرە مێردەتـان ماندوو کرد .. هەستن و بڵاوەی لێ بکەن .. منیش دەسـتی بـاوکم گـرت و پێکەوە دەرچووین .. کاتێ چووینە سـەر رێگاکـە .. بـاوکم سـیخورمەیەکی لێدام .. پاشـان وتـی: ئـەی کـوڕی خـۆم .. چـەند ئایـەتێکی بـە سـەرماندا خوێندەوە ئەگەر بە دڵەکانت لێی تێ بگەیشتایەی ئەوا چەند برینێکی پێوە بە جێدەهێشت ..

بەڵێ ....

لا بُدَّ مِن شكوىً إلى ذي مُرُوءَةٍ      يُناجيك أو يسليك او يتوجع

وە لە مەزنترین رێگاکانی دامەزراو بـوون لەسـەر ئـەم دینـە .. ئەوەیـە کـە هەموو کەسێك دەبێت گوێڕایەڵی پەروەردگار بێت لە نهێنی و ئاشکرادا ..

له (سنن أبن ماجه)دا به سەنەدێکی (صحيح) هاتووه .. که خۆشەویستﷺ فەرموویەتی:

(لأعلمن أقواماً من أمتي يأتون يوم القيامة بأعمال أمثال جبال تهامة بيضاء، فيجعلها الله هباء منثورا، قال ثوبان: يا رسول الله صفهم لنا، جلّهم لنا، لا نكون منهم ونحن لا نعلم، قال: أما إنهم إخوانكم، ومن جلدتكم، و يأخذون من الليل كما تأخذون، ولكنهم قوم إذا خلوا بمحارم الله انتهكوها)[٦].

واتە: خەڵکانێك لە ئوممەتەکەم دەناسم لە رۆژی دواییدا بە کۆمەڵێك چاکەوە دێن وەکو چیاکانی (تهامة) سپییە .. بەلام خوای گەورە هەمووی پەرت و بڵاو دەکاتەوە) پوبان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەصفی ئەوانەمان بۆ بکە، با ئێمە نەبینە یەکێك لەوان بەبێ ئەوەی ئاگامان لە خۆمان بێت و نەزانین.. فەرمووی: ئەوانە برای ئێوەن.. وە هەر لە نەوەی ئێوەن .. ئەوانیش شەو نوێژ دەکەن چۆن ئێوە دەیکەن .. بەلام ئەوان خەڵکێکن ئەگەر لە قەدەغەکراوەکانی خوا دوویەدوو بونایەتەوە و کەس دیار نەبوایە ئەوا ئەنجامیان دەدا) .

رۆژێك ئافرەتێك لەگەڵ پیاوێکدا دوو بە دوو بوونەوە .. و شەیتان سێیەمیان بوو ... بۆیە ئەو ئافرەتە بانگی کرد بۆ ئەنجامدانی کاری خراپە.. کابرا وتی: پیاوێك بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد ئاسمان و زەوییەکانە بفرۆشێ بە تام و چێژێکی کاتی .. بە بێ گومان ئەوە کەسێکی شێتە ..

---

(٦) (رواه ابن ماجة، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح سنن ابن ماجة: ٤٢٤٥، وصحيح الترغيب والترهيب: ٢٣٤٦).

وە پیاوچاكان هەردەم كاری نهێنییان هەبووە تەنها لە نێوان خۆیان و خوادا و هیچ كەس نەیدەزانی .. وەكو بەخشینی پارە بە نهێنی . یان ئامۆژگاری كردنی كەمتەرخەمان .. یان لە ئەستۆ گرتنی هەتیوان .. یان بێوەژنێك یان هەژارێك .. یان شەو نوێژكردن .. یان بە رۆژ بە رۆژوو دەبوون .. یان پاڕانەوە و داوای لێبوردن لە خوای گەورە ... یان خەتم كردنی قورئان .. یان یادی بەردەوامی خوای گەورە و میهرەبان .. و خوای گەورە هەرگیز چاكەی چاكەكاران بزر ناكات.

ابو بكر ﷺ ئەگەر رۆژانە نوێژی بەیانی بكردایە پاشان دەردەچوو بۆ ئەو بیابانە.. ماوەیەك دەمایەوەو پاشان دەگەڕایەوە بۆ مەدینە .. بۆیە (عمر) ﷺ سەرسامی ئەو كارە بوو .. رۆژێك لە پاش ئەوەی نوێژی بەیانی كرد بە نهێنی شوێنی كەوت.. بینی ابو بكر لە مەدینە دەردەچێت و دەچێت بۆ چادرێكی كۆنە لەو بیابانەدا .. بۆیە عمر ﷺ لە پشت بەردێكەوە خۆی حەشار دا .. ابو بكر ﷺ ماوەیەك لە چادرەكەدا مایەوە .. پاشان دەرچوو.. پاشان عمر ﷺ لە پشت بەردەكە هاتە دەرەوەو چووە ژوورەوە بۆ چادرەكە .. بینی ئافرەتێكی لاوازی نابینا لەگەڵ كۆمەڵێك منداڵی بچووكدا دانیشتووە ... عمر ﷺ پرسیاری لەوان كرد: ئەو كابرایە كێیە دێت بۆ لاتان؟؟ ئافرەتەكە وتی: نایناسم .. بەڵام ئەوە كابرایەكی موسڵمانە .. هەموو بەیانییەك دێت بۆ لامان بۆ ماوەیەكی زۆرە .. عمرﷺ وتی: چی دەكات؟؟ ئافرەتەكە وتی: ماڵەكەمان بۆ دەماڵێت .. وە هەویرەكەمان بۆ دەشێلێت .. وە حەیوانەكانمان بۆ دەدۆشێ .. و پاشان

دەڕوات .. بۆیە عمر ﷺ هاتە دەرەوە و لەبەر خۆیەوە دەیووت: بە ڕاستی جێنشینەکانی پاش خۆتت ماندوو کرد ئەی ابو بکر ﷺ.. بە ڕاستی جێنشینەکانی پاش خۆتت ماندوو کرد ئەی ابو بکر .. .

بە ڕاستی عمر ﷺ خۆیشی هیچی دوور نەبوو لە ابو بکرەوە لە خواپەرستی و دڵسۆزی .. ڕۆژێك لە شار هاتە دەرەوە .. کابرایەکی ڕێبواری بینی لە ناوەڕاستی ڕێگاکە چادرێکی داناوەو لەوێ نیشتەجێ بووە .. وە لەبەر دەرگاکەی دانیشتووە .. بەڵام حاڵی تێك چوو بوو .. بۆیە عمر ﷺ پرسیاری لێ کرد: تۆ کێی؟ ووتی: من کابرایەکی دەشتەکیم .. هاتووم بۆ لای ئەمیری ئیمانداران بۆ ئەوەی شتێکم لە بەخششەکەی خۆی پێ ببەخشێ .. عمر ﷺ گوێی لە دەنگی ئاهو ناڵەی ئافرەتێك بوو لەناو چادرەکەوە دەهات .. پرسیاری لێ کرد .. کابرا ووتی: بە ڕێگای خۆتدا بڕۆ بۆ کاری خۆت ڕەحمەتی خوات لێ بێت .. عمرﷺ ووتی: ئەمە کاری منە.. کابرا ووتی: خێزانەکەم کاتی منداڵ بوونییەتی .. وە هیچ پارەیەك و خواردنێکم نییە و کەسیشم نییە .. بۆیە عمر ﷺ بە پەلە گەڕایەوە ماڵ و بە خێزانەکەی کە ناوی ( ام کلثوم ی کچی علی) بوو ووت: خەیرێك ڕووی تێ کردووی ئایا دەتەوێت بەشدار بیت؟؟ ووتی: چییە؟ ئەویش باسی کابرای بۆ کرد .. بۆیە خێزانەکەی کەرەستەی پێویستی لەگەڵ خۆیدا هەلگرت ..وە (عمر)یش ﷺ چەند کەرەستەیەکی هەلگرت کە پڕ بوو لە خواردن لەگەڵ مەنجەڵێك و هەندێ سووتەمەنی ..پاشان ڕۆیشتن بۆ لای کابرا .. وە خێزانەکەی عمر ﷺچووە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتەکەی ناو چادرەکە ..

ئەویش لای کابرا لە دەرگای چادرەکە دانیشت .. پاشان ئاگری کردەوەو دەستی کرد بە گرِدانی و ئامادەکردنی خواردن .. وە دوکەڵی ئاگرەکە دەچووە نێو ریشییەوە .. وە کابرایش تەماشای دەکرد .. ئەو لەو حاڵەدا بوو .. خێزانەکەی بانگی لێ کردو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران موژدەی کورێك بدە بە هاورێکەت .. کاتێ کابرا وشەی (ئەمیری ئیمانداران)ی بیست .. ترساو وتی: تۆ عمری کوری خەتتابی؟؟ وتی: بەڵێ .. بۆیە کابرا تێك چوو .. وە خۆی لە عمر دوور کردەوە .. عمر پێی وت: لە جێگەی خۆت بمێنەوە .. پاشان عمر بە دەستی خۆی مەنجەڵەکەی هەڵگرت .. و لە چادرەکەی نزیکی کردەوەو بانگی خێزانەکەی کردو وتی: ئەو خواردنەی پێ بدە تاکو تێر دەبێت .. ئافرەتەکە لە خواردنەکەی خوارد .. پاشان ئەوەی مایەوە لە چادرەکە هێنایە دەرەوە .. (عمر) یش لێی وەرگرت و لەبەر دەستی کابرای داناو.. وتی: فەرموو بخۆ .. بە راستی شەونخونیت زۆر چێشتووە و ماندوو بووی.. پاشان عمر بانگی خێزانەکەی کرد و ئەویش هاتە دەرەوە و بە کابرای وت: ئەگەر سبەینێ رۆژ بووەوە ئەوا سەرمان لێ بدە، ئەوا فەرمان بە شتێك دەکەین کە لە قازانجی تۆدا بێت ..

وە هەروەها پیاوچاکانی پاش ئەوان وەکو ئەوان بوون ..

(علی کوری حسین) کابرایەك بوو شەوانە کیسە خواردن و نانی بە کۆڵ هەڵدەگرت و دەیکردە صەدەقە .. و دەیووت: صەدەقە کردن بە نهێنی پەستی و تورەیی خوای گەورە دەکوژێنێتەوە .. کاتێ کۆچی دوایی کرد ..

بینیـان پـشتی ڕەش بووەتـەوە .. وتیـان ئەمـە پـشتی بارهـەڵگرە وە نەمانزانیوە کاری حەماڵی کردبێت .. لە پاش ئەوە خـواردن لـە سەد مـاڵی خەڵکی مەدینە بڕا .. لـە مـاڵی بێوەژنـان و هـەتیوان نەیانـدەزانی کـێ ئـەو خواردنەیان بۆ ئامادە دەکات .. پاشان بۆیان دەرکەوت ئەوە (علـی) بـووە ئەو هەموو خواردنەی بۆیان ئامادە دەکرد ..

یەکێ لە پێشینان (سەلەف) بۆ ماوەی بیست سـاڵ بـە ڕۆژوو بـوو.. ڕۆژێـك ڕۆژووی دەگرت و ڕۆژێك دەیخوارد .. وە کەس و کارەکـەی نەیانـدەزانی .. چونکە ئەو دوکانێکی هەبوو ئەگـەر ڕۆژ بوایەتـەوە دەڕۆیـشت بـۆ دوکـان و خواردنی بەیانی و نیوەڕۆی لەگەڵ خۆیدا دەبرد .. ئەگەر ئەو ڕۆژە بوایە کە بە ڕۆژوو دەبوو خواردنەکـەی دەکـرد بـە صـەدەقە .. وە ئەگـەر بـە ڕۆژوو نەبوایە ئەوا خواردنەکەی دەخوارد ئەگەر ڕۆژ ئاوا بوایە دەگەڕایەوە بۆ نـاو منداڵەکانی و لەگەڵ ئەواندا نانی ئێوارەی دەخوارد .. بەڵێ .. هەستیان بـە پەرستنی خوای پەروەردگار دەکرد لە هەموو کارێکیاندا .. بە ڕاستی ئەوانە لە خوا ترس بوون ..! وە بە ڕاستی ئەولیا و خۆشەویستی خوا بوون .. وە خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا (٣١) حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا (٣٢) وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا (٣٣) وَكَأْسًا دِهَاقًا (٣٤) لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا (٣٥) جَزَاء مِّن رَّبِّكَ عَطَاء حِسَابًا (٣٦) ﴾ [سورة النبأ].

واتـە: بە ڕاستی بۆ خواناسان و پاریزکاران سەرفرازی و خۆشـی و شـادی و کامەرانی فراوان ئامادەیە *چەندەها باخچەی جوان و جۆری تـرێ * ( لـەو

جێگە و رێگە خۆشانەدا هاوسەر و هاودەمی ) ئافرەتانی سینەجوان و (دیمەن جوان) هاوتەمەن ئامادەیە * لەگەڵ کاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا * لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕو پووچ و درۆ و دەلەسەیەك نابیستن * ئەمەش هەمووی پاداشتێکە لە لایەن پەروەرگارتەوە ( ئەی ئیمانداران)، بەخششێکە بە حسابێکی ورد دەبەخشرێت ( بە بەختەوەران) .

کەواتە موژدە بۆ ئەو دڵانە کە پڕ بوونە لە ترسی خوای پەروەردگار ..!!
وە خۆشەویستی ئەو زاڵ بووە بە سەریاندا ... گوێڕایەڵی خوای گەورە لایان بۆتە خوویەك وە جوڵانەوەی و بێدەنگیان لا بۆتە عیبادەت ..

| | |
|---|---|
| واللهِ لوْ جَالستَ نفسَكَ خَالياً | وبحثْتَهَا بحْثاً بِلا رَوَغَانِ |
| لوجَدتَ خيرَ العَيشِ عَيشَهُمْ فإنْ | تَقعُد رجَعتَ بذِلَّةٍ و هَوانِ |
| فالحقُّ شمسٌ و العُيونُ نَواظِرٌ | لا تختَفِي إلا على العمْيَانِ |
| والقلبُ يَعمَى عن هُدَاهُ مِثلَما | تَعمَى و أعظَمُ هَذِه العَينَانِ |
| و صَلاحُهُ وفَلاحُهُ و نَعيمُهُ | تجرِيدُ هَذا الحُبِ لِلرَّحمنِ |
| فَإذا تخَلّى مِنّه أصبحَ حَائِراً | ويَعُودُ فِي ذا الكوْنِ ذا خُسرَانِ |

واتە: سوێند بە خوا ئەگەر لە خۆتدا بە تەنهایی دانیشیت
وە لێی بکوڵیتەوە بە مەرجێ لێکۆڵینەوەیەکی بە بێ فرت و فێڵ
دەبینی کە خۆشترین ژیان ژیانی ئەوانە چونکە
ئەگەر دانیشیت ئەوا دەگەڕێیتەوە بە زەلیلی
راستی وەکو رۆژ وایە و چاوەکانیش تەماشاکارن
ئەو راستی یە هیچ بزر نابێت تەنها لە نابینا نەبێت

وە دڵەکانیش کوێر دەبن لە ڕێگای ڕاست هەروەکو چۆن
کوێر دەبێت —بە زیاتریشەوە— ئەم دوو چاوە
وە چاکسازی و ڕزگار بوونی و خۆشگوزەرانی
ئەوەیە تەنها خۆشەویستیت بۆ خوا بهێلیتەوە
ئەگەر وازی لێ بهێنی ئەوا سەرسام دەبێت
ئەوا لە گەردووندا بە خەسارەت مەندی دەگەڕێتەوە
وە ئەو کەسەی لەسەر ئەم دینە بەردەوامە ... با مەغرور نەبێت بەو بەردەوامییە.. وە مەغرور نەبێت بە زۆری نوێژو عیبادەتەکانی .. بەڵکو داوا لە خوا بکات کە دامەزراوی بکات لەسەر ئەم دینە .. داوای پارێزگاری و دڵنیایی لێ بکات ..
تەماشای بت شکێن بکە .. دروستکەری کەعبەی پیرۆز .. ئیبراهیم (عليه السلام) کاتێ کە کەعبەی پیرۆزی دروست دەکرد، لە خوا دەپاڕایەوەو دەیفەرموو:
﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ (٣٥) ﴾ [سورة إبراهيم] .
واتە: خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.
کێ لە پاش ئیبراهیم (عليه السلام) لە خۆی دڵنیایە لە گومڕا نەبوون ...؟
قالت أم سلمة (رضي الله عنها): كان أكثر دعاء النبي ﷺ أنه كان يقول:
(اللهم يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك)[٧].

(٧) (رواه الترمذي، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الجامع الصغير: ٤٨٠١).

ئوم سەلەمە دەفەرمێت: زۆربەی پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو کە دەیفەرموو: پەروەردگارا ..ئەی ئەو خوایەی دڵەکان ئەمدیو ئەودیو دەکەیت دڵمان لەسەر دینەکەت دامەزراو بکە .

وە پەنای دەگرت بە خوا لە گومڕا بوون لە پاش هیدایەت ..

وە لە بەهێزترین ڕێگاکانی دامەزراو بوون: خۆ خەریك کردنە بە میراتی پێغەمبەرانەوە(علیهم الصلاة والسلام) .. ئەویش بە شوێن کەوتن و داواکردنی زانستی سوود بەخشە .. وە ئامادە بوون لە مەجلیسەکانی زانستدا .. وە تێکەڵ بوون لەگەڵ ئەهلی زانستدا .. وە خوێندنەوەی کتێبەکانی .. وە بزانە کە زانایەك سەختترە لەسەر شەیتان لە هەزار خواپەرست .. وە فەزڵی زانا بەسەر خواپەرستەوە وەکو فەزڵی (مانگ)ە بەسەر هەموو ئەستێرەکانەوە .. وە لە کۆتاییدا لە ڕێگاکانی دامەزراوبوون لەسەر ئەم دینە ئەوەیە کە دەبێت بەندە چاوەڕوانی پاداشت بکات لەسەر هەموو ئەو گوێڕایەڵیانەو دوور کەوتنەوەی لە قەدەغەکراوەکان ...

سەیرە.. چۆن کەسێکی ژیر ئەوەی کە چاو نەیبینیوە و هیچ گوێیەك نەیبیستووە و بە خەیاڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە دەفرۆشێت بە ژیانێکی کاتی کە وەکو خەو وایە ..؟!!

سەیرە ..چۆن بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد زەوی و ئاسمانەکانە دەفرۆشێت بە بەندینخانەیەك کە پڕە لە بەڵاو نەهامەتی ..؟؟!!

یان جێگانشینێك کە رووبار بە ژێریدا دەڕوات دەفرۆشێت بەکەلاوەیەك کە کۆتاییەکەی نەمان و وێرانەیە ..؟!!

سەیرە .. چۆن ئەو کچە جوانانەی کە دەڵێی گەوهەر و مەرجانن بە ئەو کچە پیس و چەپەڵ و بێ نرخ و سووکانە دەگۆڕێتەوە..؟!!

یان چۆن روبارێك لە مەی کە ئەوەی دەیخواتەوە تام و چێژێکی زۆر دەکات دەفرۆشێت بە خواردنەوەیەك کە دین و دونیات لێ تێك دەدات ..؟!!

سەیرە .. چۆن تەماشا کردنی رووی خوای بە عیززەت و دانا دەفرۆشێت بە تەماشا کردنی ئافرەتێکی خراپەکاری ناشیرینی پیس ..؟!!

یان چۆن بیستنی وتاری خوای میهرەبان دەفرۆشێت بە مۆسیقا و ئاوازەکان .؟!

چۆن دانیشتن لەسەر مینبەرێك لە مرواری دروست کراو لە رۆژێکدا کە خوای گەورە بەردەوام زیاتر دەبەخشێتە بەندەکانی دەفرۆشێت بە دانیشتن لەگەڵ هەموو شەیتانێکی خراپدا ..؟!!

بەڵێ .. چۆن رقت لێی دەبێت؟!! لە کاتێکدا ئەوەماڵێکە خوای گەورە بە دەستی خۆی ئامادەی کردووە .. و کردوویەتییە مەنزڵگای خۆشەویستەکانی خۆی ..! وە وەصفی چوونە ژوورەوەی بۆ ئەو جێگە کردووە بە (الفوز العظیم) واتە:(سەرکەوتنی مەزن)، وە موڵکایەتییەکەی بە (المُلك الکبیر) ناوبردووە ..

ئەگەر پرسیاری گڵەکەی دەکەیت ئەوا لە مسك و زەعفەرانە ...

وە ئەگەر پرسیاری سەقفەکەی دەکەی ئەوا عەرشی پەروەدگارە..

وە بەردەکەی لە مرواری و گەوهەرە ...

وە دیوارەکانی لە ئاڵتون و زیوە...

ئەگەر پرسیاری بەروبومەکانی دەکەی ئەوا لە هەنگوین بەتام ترە..
ئەگەر پرسیاری گەڵاکانی دەکەیت ئەوا لە ئاورێشم نەرمترە ..
بەڵام رووبارەکانی ماستاوەو بە هیچ شێوەیەك تامی ناگۆڕێت ..
وە چەندەها رووبار لەمەی ئەوانەی کە دەیخۆنەوە تام و چێژێکی زۆری لێ وەردەگرن ... وە چەندەها رووبار لە هەنگوینی پاك و پاڵاڤتە .. وە خواردنەکەیان میوەیەکە کە بە ئارەزووی خۆیان هەڵیدەبژێرن .. وە گۆشتی باڵندە کە خۆیان حەزی لێ دەکەن .. وە جلوبەرگی دانیشتوانەکەی لە ئاوریشم و ئاڵتونە .. وە جێگای پشوودانیان بەرزترین نرخ و پلەی هەیە.. وە خزمەتکارەکانیان منداڵی جوان و نەمرن کە دەڵێی مرواری پۆشراون .. ئەوان لە باخ و باخاتەکانیدا یاری دەکەن و رادەبوێرن .. وە لە بەرهەمەکانی تام و چێژ وەردەگرن .. وە هەردەم ئەو منداڵە جوانانە بە دەوری ئەواندا دەسوڕێنەوە .. ئەو رۆژە لە خواترسان بە نوێنەرایەتی بەرەو لای خوای گەورە دەڕۆن .. وە تاوانباران بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن..

بەهەشت چەندە سەیرە ... !!؟؟

ئەوانەی ئەو بەهەشتەیان دەوێ چۆن خەویان لێ دەکەوێ؟!

وە چۆن ئامەزرۆیانی بەهەشت پێشبڕکێی بۆ ناکەن لە کاتێکدا خواکەیان بانگیان دەکات و دەفەرموێت:

﴿يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ (٦٨) الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ (٦٩) ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ (٧٠) يُطَافُ

عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٧١) وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٧٢) لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ (٧٣)﴾ [سورة الزخرف] .

واتە: خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ ئیتر ئێوە هیچ ترس و بیمێکتان نابێت و هیچ غەم و پەژارەیەك رووتان تێناکات * ئەو بەختەوەرانە ئەو کەسانەن کە کاتی خۆی باوەڕیان هێناوە بە ئایەتەکانی ئێمە و نیشانەکانی دەسەڵاتداریمان لە بوونەوەرداو موسڵمان بوون *پێیان دەوترێت: فەرموون بچنە بەهەشتەوە خۆتان و هاوسەرانتان، خۆتان و ئەوانەی وەك ئێوە خواناس بوون و لەوێ ژیانی کامەرانی و شادی و بەختەوەریتان پێدەدرێت * لە سەر سینی و کوپی ئاڵتون جۆرەها خواردن و خواردنەوەی جوان و رازاوەو تام خۆش و بۆن خۆشیان بە سەردا دەگێڕن و لەو بەهەشتەدا هەرچی نەفس حەزی پێ بکات و دڵ بیخوازێت و چاو حەز بە بینینی بکات ئامادەیە و ئێوە: ئەی خواناس و پاکان، ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەشی تیادا دەبەنەسەر * **(خوای میهرەبان ئەوەندەی تر دڵخۆشیان دەکات، کاتێك پێیان دەفەرموێت)**: ئا ئەو بەهەشتەی کە ئێستا ئێوە بوونەتە خاوەنی، وەك میراتی شایستەی خۆتانە، بە هۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەتانکرد * میوەهاتی زۆرو هەمە جۆر تیایدا بۆتان ئامادەیەو لێی دەخۆن ( هەرگیز تەواو نابێت و کەم ناکات ) .

خوشك و برایانی بەڕێز ...

ئەمانە رێگاکانی دامەزراو بوونن .. بۆ ئەو کەسانەی کە رزگاری و سەرفرازیان دەوێ .. وە ئێمەیش لەسەردەمێکداین کە فیتنەی تیادا زۆر بووە .. وە کۆسپەکان و کێشەکان رەنگاو رەنگ بوون ... چەند جۆرە فیتنەیەك توشی چاوەکان دەبن .. وە جۆرێکی تر توشی بیستن دەبێت .. وە سێیەم خراپەکاریت لا ئاسان دەکاتەوە ... وە چوارەم بانگت دەکات بۆ پارەی حەرام .. تاکو حاڵی ئێمە نزیکی ئەو سەردەمەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی:

( فإن وراءكم أيام الصبر، الصبر فيهن كقبض على الجمر، للعامل فيهن أجر خمسين منكم، يعمل مثل عمله، قالوا: يا رسول الله أو منهم.قال: بل منكم)[٨][(٨)].

واتە: لە پاش ئێوە رۆژگاری ئارامگرتن هەیە، ئارامگرتن تیادا وەکو ئەوەیە کەسێك ئاسکڵ (پشکۆ) بە دەستەکانی بگرێت، ئەو کەسانەی کە کاری چاکەی تیادا دەکەن پاداشتی پەنجا کەس لە ئێوەی هەیە ئەگەر وەکو کارەکەی ئەو بکات .. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .. لە خۆیان؟؟ وتی: بەڵکو لە ئێوە .

وە لە (مسلم) دا هاتووە.. کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(بدأ الإسلام غريبا .. وسيعود غريبا كما بدأ فطوبى للغرباء)[٩][(٩)].

---

(٨) (رواه الترمذي وابن ماجة، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الترغيب والترهيب: ٣١٧٢).

(٩) (رواه مسلم وابن ماجة، وانظر صحيح سنن ابن ماجة: ٣٩٨٦).

واتە: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێ کردووە وە بە نامۆییش دەگەڕێتەوە هەروەکو چۆن دەستی پێ کرد، موژدە بۆ نامۆکان) بەڵێ ..موژدە بۆ نامۆیان .. لە کۆتایی سەردەمدا پاداشتی چاکەکاران زیاتر و زۆرتر و گەورەتر دەبێت چونکە خەریکە وای لێ دێت هیچ هاوکارێك لەسەر چاکەکاری نادۆزێتەوە ...ئەو کەسێکی نامۆیە لەنێو سەرپێچی کاراندا بەڵێ ئەو نامۆیە لە نێوانیاندا .. ئەوان سوو (ربا) دەخۆن کەچی ئەو نایخوات . ئەوان گوێبیستی گۆرانی دەبن کەچی ئەو گوێبیست نابێت .. ئەوان تەماشای قەدەغەکراوەکان دەکەن کەچی ئەو تەماشای ناکات .. بەڵکو ئەوان توشی شیرك و جادوو دەبن کەچی ئەو توش نابێت .. هێشتا ئەو بەردەوامە لەسەر یەکخواپەرستی .. وە (ئیمامی بوخاری) ریوایەتی کردووە... کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(لا يأتي عليكم زمان إلا الذي بعده شر منه حتى تلقوا ربكم)[10] .

واتە: هیچ سەردەمێك بە سەرتاندا نایەت ئیللا ئەوەی پاش ئەو دێت لەو خراپترە تاکو دەگەنە خوای خۆتان .

وە (البزار) بە سەنەدێکی (حسن) ریوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەفەرموێت:

(يقول الله عز وجل: وعزتي لا أجمع على عبدي خوفين، ولا أجمع له أمنين، إذا أمنني في الدنيا أخفته يوم القيامة، وإذا خافني في الدنيا أمنته يوم القيامة)[11] .

---

(١٠) (رواه البخاري، وانظر: سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٦).

(١١) (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢٦٦٦).

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: سوێند بە عیززەتی خۆم لەسەر هیچ بەندەیەکم دوو ترس و دوو دڵنیایی کۆ ناکەمەوە .. ئەگەر لە دونیادا لێم دڵنیا بوو ئەوا لە دوارۆژدا دەیترسێنم .. وە ئەگەر لە دونیادا لێم ترسا ئەوا لە دوارۆژدا دڵنیای دەکەم) بەڵێ .. هەرکەسێ لە دونیادا لێی بترسێ... جەلالەتی خوای گەورەی بە مەزن زانی .. ئەوا لە رۆژی دواییدا دڵنیا دەبێت.. وە بە گەیشتن بە خوای گەورە دڵخۆش دەبێت .. وە دەبێتە یەکێك لە ئەهلی بەهەشت کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموویت:

﴿تَرَى الظَّالِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ لَهُم مَّا يَشَاؤُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الكَبِيرُ (٢٢)﴾ [سورة الشورى].

واتە: (لە رۆژی قیامەت و لێپرسینەوەدا) دەبینیت ستەمکاران دەترسن لەوەی کە کردوویانە، لە کاتێکدا سزاکەی کەوتووە بە سەریاندا و لێی دەرباز نابن، هاوکات ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لە باخچەکانی بەهەشتدا ژیانی کامەرانی دەبەنەسەر، چیان بوێت لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان ئامادەیە، ئا ئەوەیە خەڵات و بەخششی گەورەو بێ سنوور).

کەوابوو پەنا بە خوا بگرە و دڵنیابە کە تۆ لەسەر حەق و راستی ئاشکرایت .. وە بە زۆری خراپەکاران مەغرور مەبە .. وە بە کەمی دامەزراوان و ئەوانەی رێگای راستیان گرتووتە بەر غەمبار مەبە ..

| | |
|---|---|
| يا مُـعـرِضـاً عـمّـا يُـرادُ بــه وقـد | جَدّ المسيرُ فمُنـتَهـاهُ دانِـي |
| جـذلانَ يـضـحـكُ آمِـنـاً مُـتبـختِراً | وكأنّـهُ قـد نَـال عَـقـد أمَـانِ |
| خَلـعَ الـسّرُورُ علـيْـهِ أوْفَـى حُـلـةً | طَرَدتْ جميعَ الـهَـمِّ والأحزَانِ |
| يختالُ فـي حُـلَـلِ الـمَسَرّةِ نَـاسِيـاً | ما بعدَها مِن حُلـةِ الأكـفـانِ |
| ما سَعيُـهُ إلا لِـطيـبِ الـعَيـشِ فـي | الدّنيَا ولو أفْضَى إلى النّيرانِ |
| قَد باعَ طيبُ العَيشِ في دارِ النعيمِ | بذا الحُطامِ المُضْمَحِلِّ الفانِي |

واتە: ئەی ئەو کەسەی پشتی کردووە لەوەی دەیەوێ لە کاتێکدا

رێگای زۆری بڕیوە و کۆتاییەکەی نزیك بووەتەوە

دڵخۆشە و پێدەکەنێ بە بێ ترس و فیزەوە

وا دەزانێ گرێبەست ئاسوودەیی دەست دەوتووە

لە خۆبایی دەبێت لە نێو خشڵی شادیدا و لە بیری چووە

ئەو کاتەی لە پاشان دێت کە لە نێو کفنەکەیدا دادەنرێت

هەوڵ و کۆششی ئەو تەنها بۆ خۆشگوزەرانی دونیا بووە

هەرچەندە لەو پێناوەدا راپێچ بکرایە بەرەو ئاگر

ئەو خۆشگوزەرانی ژیانی نێو بەهەشتی فرۆشت بە

ماڵێکی تێکشکاوی تەفروتونابووی تیاچوو

**********

دارا

لەخوا دەكەم

هەموومان موەفەق

بكات بۆ كاری چـاكە و

وازهێنانی خــــراپەكاری وە

بمانپارێزێت لە فیتنە ئاشكاركان و

نهێنیێكان ..

اللهم يـــــا مقلب القلوب ثبت

قلوبنا على طاعتك ..

**والحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآله وصحبه أجمعين.**